ناوی کتێب: ڤیڤا زاپاتا
نووسینی: جون شتاینبگ
وەرگێرانی: محەمەد موکری
بڵاوکراوەی ئاراس – ژمارە:
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: شوان عەبدولقادر
دەرهێنانی بەرگ: حەمید ڕەزا ئازمعوودە
پیت لێدان: دیار عەبدولکەریم
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی دووەم ، هەولێر – ٢٠٠٧
لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر ژمارە (٦١٨)ی ساڵی ٢٠٠٧ی دراوەتێ

# شۆڕشگێڕیٚ

ولاّتی مەکسیك لە دوا سالاّنی سەدەی نۆزدەهەم بەتايبەتی سەرەتای سەدەی بیستەم یەکیٚ بوو لە ولاّتە پڕ لە ئاشوبەکانی دەورانی خۆی. حکومەتە دکتاتۆرییەکان، کە پەیوەندی ڕێك و لەباریان لەگەڵ ولاّتانی ئیستیعماری ئەوروپا و ئەمریکادا هەبوو. مەردومی هەژار و زەحمەتکێش لەژێر دەسەلاّتی زاڵمانەی خۆیاندا هێنابووە ژێر ئەشکەنجە، رەنج و دەستهاتیان بەفیڕۆ دەبردن.

لە کاتی بەرپابوونی حکومەتی (پورفیریودیاز)دا شۆڕشگێڕانی مەکسیك، هەریەکە لە لای خۆیەوە، حکومەتێکی ناوخۆیی دامەزراند بوو هەریەکە و داوای رابەری میللەتی دەکرد. ناسراوترین ڕابەران، بە پلەی یەکەم (پانچۆمیلا) و (ئەمیلیانۆ زاپاتا) بوون. لەو دەمەدا هەریەك لەو رابەرانە چەندین چەکداریان هەبوو ناوی (ژەنراڵ) یان لە خۆ نابوو، هەرێم و ناوچەکانی ژێر دەسەلاّتیان، بەرەو ئاشوب کێشابوو. هەندیٚ لەم ژەنرالاّنە لە دزو ڕێگری نێو چیاکان زیاتر نەبوون. تەنها لەبەر دزی و شڕەخۆری ناوی شۆڕشگێڕیان لە خۆ نابوو. هەندێکی دیشیان وەك (پانچۆمیلا) و (ئەمیلیانۆ زاپاتا)، وەفاداری ئامانجی شۆڕشگێڕی و ئینسانی بوون.

(ئەمیلیانۆ زاپاتا)ی شۆڕشگێڕی گەورەی مەکسیك لە ڕۆژی ١٨٨٣/٨/٨ لە گوندی (سان میگل ئانەندکویلکو)، سەربە قەسەبچەی (ئايالا) کە دەکەوێتە هەرێمی (مۆرەلوس)، لە دايك بووە، لە مانگی چواری ١٩١٩دا و لە تەمەنی ٣٦ ساڵی لەبەر خیانەتی یەکێك لە نزیکەکانی خۆی دەکوژرێت.

زاپـاتـا، لادێ نشینـێکـی نـەخـوێنـەوار بـوو لـە مـانـگـی سێی **١٩١١دا** پـەیـوەنـدی بـە بـزوتـنـەوەی (فـرانسیسکـۆ مـاردۆ)وە کرد، تـا مـەکسیك لـە بەدکاری حکومەتی (پورفیریودیاز) ڕزگار بکات. لە مانگی **١١**ی هەمان ساڵدا، بەرنامە بەناو بانگەکەی، (ئەیالا) بۆ چاککردن و دابەشکردنی زەوی و زار پێشکەش کرد. بەڵام پاش ئەوەی، لەگەڵ (فرانسیسکۆ مادرۆ)دا نەگونجا و بە سەرۆك کۆماری نەزانی.

لە ساڵی **١٩١٣** پاش ئیعدام کردنی (ماردرۆ لە لایەن یاخیبووانی (کـاوانـزا)وە، ئـەمـجـارە، زاپـاتـا لـەگـەڵ هـێزە شۆڕشگێڕەکـەی (پـانـچۆمیلا) یەکیان گرت و دژ بە (کاوانزا) شۆڕشیان گەرمتر کرد. لە ساڵی **١٩١٦** ئەم دوو هێزە شۆڕشگێڕە مەزنە، شاری مەکسیکۆیان ئازاد کرد. (کاوانزا) بەناچاری شاری جێهێشت و هەڵات، پاشانیش (زاپاتا) ناچار بوو بەرەو (مـۆرەلـۆس) بگـەڕێتـەوە و لـە ژێر دروشمـی (زەمین، ئـازادی، مـەرگ بـۆ زەمـیـنـداران) درێژەی بـە تـێکـۆشـانـدا. لـەو چـەنـد ساڵانـەی تێکـۆشـانیدا (ئۆفیمۆی) برای گەلێ هاوکاری و کۆمەکی کرد، بەڵام بەداخەوە دەست و پـێوەنـدە سەرەڕۆ و شڕە خـۆرەکـانـی دەوروبـەریـان ـ گـونـدەکـانـی نێوان (کورانـاوکـار و مـەکسیکۆ)یـان پێچـایـەوەو لرفـانـدیـان. زاپاتا بـەزەحمەت دەیتوانی کۆنترۆڵیان بکات.

هــەنــدێ کــەس (زاپــاتــا) بــە (رفــورمــیست) و رابــەری ئــازادی و چاککردنەوەی زەوی و زاری دەزانن، هەندێکی دیش بەنێوی (ئـاتیلای) جـنـوبـی مـەکسیك نـاوی دەبـەن، هـەرچـی بـووە، تـادوا هـەنـاسەی بـۆ لـەحزەیێکیش دەستی لـە ئـامـانجەکـانـی خـۆی هـەڵنـەگرتووە هـەر لـەسەر هەمان ڕێدا گیانی سپارد و خۆی بەخت کرد.

## نووسەری ئەم ڕۆمانە

لـە ساڵـی ١٩١٥ جـان ئـیشتـایـن بگ، نـووسەری بـەنـاوبـانگـی ئـەمریـکـا بـەرەندەی خـەڵاتـی نۆبڵ، کورتـە ڕۆمـانێکی دەربـارەی ژیـان و تێکۆشانی (ئـەمیلیـانۆ زاپاتا) نووسی. ئەم ڕۆمـانـە لە لایـەن (ئـەلیـاکـازان) دەرهێنـەری مـەزنی سینـەمـا، زۆر بـەجوانی پـەسـەند کرا هـەر لـەسـەر بنـاغـەی هـەمـان داستـان و سینـارێوی فیلمی بـەنـاوبـانگی (بژی زاپاتا)ی سازدا.

جان ئیشتاین بگ لە ١٩٠٢ لە (سالیناس ـ ی کالیفۆرنیا) لە دایك بـووە، لـە ساڵـی ١٩٦٨ لـە (نـیـویـورك)دا بـۆ دواجـار چـاوانـی لێك نـاوە. خوێندنی لە دانیشگای (ئیستانفورد) تەواو کردبوو. کاری جۆراو جۆری لە ئەستۆ گرتبوو یەکەمجار دەستی دایە قەلەم داستانێکی مێژووی نوسی دەربـارەی (ڕووداوەکـانی مورگان ـ کە دزی دەریا بوو ـ بە ناوی) (فنجانی زێڕین) سەرنجی چ کەسێکی ڕانەکێشا.

نـاوی دووەم کتێبی (چەمـەنزارە، کـانی مـەلـەکوت) ١٩٣٢، کە یەکێکە لە نووسینە هـەرە چاکەکانی، هـەروەهـا داستانی (خوای نەناسراو) ١٩٣٣ وەك نووسینـەکەی پێشووی هیچ فرۆشێکی نەبوو.

لە ساڵی ١٩٣٥ داستـانی (تورتیلا فلات)ی نووسی دەربـارەی ژیـانی لادێ نشینانی کالیفۆرنیایە، سەرکەوتنێکی چاکی وەدەست هێنا بەهۆی ئـەم ڕۆمـانـەوە وەك ڕوخسارێکی ئـەدەبی پرشنگدار نـاسرا.

ساڵی ١٩٣٦ داستـانی (لە نەبـەردی گومـانلێکراودا) دەربـارەی مـانگرتنی کرێکاران و تێکۆشانی سیاسی بوو، بووە جێی ڕەزامـەندی ئـەدیبـان و کـتـێب نـاسان، لـە ساڵـی ١٩٣٧ داستـانـێکـی دەربـارەی (مشکـان و ئینسانـەکان) نووسی، نـاوبـانگی جیهـانی پێوەرگرت و بووە هۆی ئـەوەی لە

پاڵ نووسەرانی وەك هەمەنگوای فاكنەر بناسرێت.

لە ساڵی **١٩٣٩دا** ژیانی ئەدەبیی، بەجۆرێكی دی كەوتەوە ئەویش بەهۆی ڕۆمانە بەناوبانگەكەی (هێشووەكانی توڕەیی)وە بوو. ئەم ڕۆمانە دەربارەی ژیان و ڕەنج و بێواری كەسانی (ئوكلاهیمایە) كە بۆ پەیدا كردنی بەهەشتی مەوعود بەرەو (كالیفۆرنیا) هجرەت دەكەن. هەمان كتێب بووە هۆی ئەوەی خەڵاتی ئەدەبی (پولستیزەر)ی پێ وەرگرێ.

لە ساڵی **١٩٤٠** چووە مەكسیك تا فلیمێكی كورت (دكومانتەر) سازبدات تاقیكردنەوەكانی هەمان سەفەری بووە زەمینەی داستانەكانی: (كنسرو سازان ـ **١٩٤٥**)(بژی زاباتا ـ **١٩٥١**) و (پێنجشمەی فێنك ـ **١٩٥٤**).

لە ساڵانی جەنگی دووەمی جیهانیدا دووەم داستانی (مانگ پەنهانە) دەربارەی جەنگی پارتیزانەكان دژ بەنازییەكانی نووسی. ئەم ڕۆمانە بەتایبەت لە ئەوروپادا گەلێ پسەند كرا.

لە ساڵی **١٩٤٧** (مراوری) لە **١٩٥٢** (بەهەشت)ی نووسی.

بێگومان جان ئیشتاین بگ گەورەترین روخساری ئەدەبی ئەمریكایە داستانەكانی، گیانی شۆڕشگێڕی و عەقیدەی سیاسی پێشكەوتووی گرتووەتە خۆ.

## ئەم کتێبە

جـان ئـیشتـایـن بگ داستـانـی (ڤیڤـا زاپـاتـا)ی لـە ساڵـی **١٩٥١** داخستـە بـەردەست کۆمپـانیـای فلیمسازی فوکس ـ ی سەدەی بیستـەم. پـاشـان لـەسـەر هـەمـان بنـاغـەی داستـانەکە، خۆی سینـارێوی بۆ نووسی.

(ئەلیاکازان) لەڕوی سینـاریۆکەی ئیشتاین بگ، فلیمە بەنـاوبـانگەکەی (ڤیڤا زاپـاتـا)ی دەرهێنـاوە، کە (مـارلـۆن براندۆ) بەشداری تیـادا کردبوو. دەقـی داستـانـەکـە بـە کـۆمـپـانـیـای فـوکس فـرۆشرابـوو. ئـەمـەیش دەقـی داستـانـەکـەیـە.

***

لە گوندی (مۆرەلوس) هـەموو لەو بـاوەڕەدان کە (ئەو) هێشتـا زیندووە. لادێیـەکـان دەڵێن:

لـە ژێر تـریـفـەی مـانـگـە شەودا، ئـەسپـێکـی سپـی لـە نـێو تـەپـۆڵکـە بۆرەکاندا، بە ئـارامی دەلـەوەڕێ لە نزیکی ئەسپەکەیشدا سێبەرێ دەجوڵێتەوە، کە ڕۆژێ لە ڕۆژان ڕابـەری ئـەمـان بووە. (ئەو) ئێستـا لـە شێوەی خـەون و ئـەفسانـەدا دەردەکـەوێ بـەڵام (ئـەو) زوو، وەکـو هـەموو جوتیـارەکانی (مۆرەلوس) ئینسانێکی گیـاندار بووە، پیـاوێ بوو ئـاشتی دەویست، کەچی تـەنها جەنگی بەنسیب دەبوو، سەربـازێ بوو، بێزی لە کوشتن دەهـاتـەوە، بـەڵام بەنـاوی ئـەوەوە خـەڵکـانێکی زۆر کوژران، جـەنگـاوەرێکی قـارەمـان بوو، بـەبێزارییـەوە. دەجـەنگا (ئەو) ئەمیلیـانۆ زاپـاتـا بوو.

## ١

ساڵی ١٩١١ بوو (پورفیریودیاز)ی سەرۆك کۆمار، ماوەی سێ چوار ساڵ بوو حوکمی مەکسیکی دەکرد. تێشتی لەگەڵ سەفیری ئەڵماندا خواردبوو و گەڕابووەوە سەفیری ئەڵمان، بە سەرۆك کۆماری گوتبوو کە پارەیێکی چاکی لە بانکەکانی ئەڵمانیا بە ناوی ئەوەوە داناوە، هەروەها پێی گوتبوو، سەرئەجام ڕۆژێ پێویستی بەو پارەیە دەبێت کە لە بانکەکانی دەریدایە. پاشان سەفیری ئەڵمان بە (دیاز)ی ڕاگەیاند کەوڵاتەکەی ئەم نیازی وایە لە بیابانەکانی (تامپیکۆ) بەدووی دەرهێنانی نەوت دەست بە کار بکات. لەم ڕووەوە تکای ئیمتیاز وەرگرتنی کردبوو.

سکرتێری سەرۆك لیستی ناوی چاوپێکەوتنەکانی ئەو ڕۆژەی دایە دەست سەرۆك کۆمار، کاتێ کە (دیاز) سەیری لیستەکەی دەکرد، سەیری کرد. دەبێ چاوی بەسەفیرەکانی ئینگلیزو فەرەنساو ژاپۆن بکەوێ. ئەوانیش ئومێدەواری ئەوەبوون، ئیمتیازی ئەوەیان بدرێتێ کانی پڕ سامان و نەوت وەدەستبێنن. بەڵام (دیاز) نەیدەتوانی هەموویان قایل بکات دەبا باوەڕی پێ بێنن، ئەڵبەتە ئەم کارەش پارەی پێویستی دەویست (دیاز) لیستی ناوەکانی دایە دەستی سکرتێرەکەی و پێی گوت، بەر لە هەموان با لادێیەکانی (مۆرەلوس) بێن. ئەم کارە لە هەمووی سادەتر بوو، چاوپێکەوتن لەگەڵ دێهاتیەکاندا. تەنها بۆ یەك مەسئەلەیە و هەمیشە تاقە چارەسەرێکیشی هەیە.

سکرتێری سەرۆك کۆمار لیستی ناوی نوێنەرەکانی لە بەردەم دانا (دیاز) چووە چکۆلەترین ژووری تەلاری سەرۆك کۆماری کە تایبەت بوو، بەم جۆرە چاوپێکەوتنانە، نوێنەرەکان سێ کەس بوون، پێشتر چووبوونە ئەو ژوورە. سەرۆك کۆمار لە نیگای یەکەمدا سەرنجی (ئەمیلیانۆ زاپاتا)ی

نەدا. بەڵام ئەوەی بینی کە هەموو ڕووەو ئەو وەرچەرخان.

(زاپاتا)ی لاو، پێستی لەشی بەهەتاو سوتاو، ڕەنگێکی قاوەیی پێ بەخشی بوو چاوە ڕەشەکانی درەوشانەوەی تایبەتیان هەبوو (دیاز) لە پشت مێزێکی بێ ئارایشت دانیشت و روخسەتی قسانی دایێ.

(زاپاتا) چووە پێشی، بەشپرزەییەوە وشەکان لەنێو لێوەکانیەوە دەهاتنە دەرو گوتی، لەوەڕگا گشتییەکان و زەوی هاوسێکانی لە لایەن موڵکدارە گەورەکانەوە داگیر کراون. ئەو زەویانە هی ئەمانە، تەنانەت بەر لە ڕزگاریش هەر هی ئەمان بووە.

(دیاز) بزەی هاتێ و پرسیاری کرد، کە ئایا بۆ سەلماندنی ئەم قسانە دەلیلیان هەیە؟ (زاپاتا) لە ڕووی و قارەوە سەری راتەکان و گوتی، بەڵێ سەنەدیان هەیە. پاشان (دیاز) دەستی بەقسان کرد گەلێ سادە بوو ئەوەی دەرخست، کە دەبێ سنورەکان دەستنیشان کرێن، پاشان لە دادگا شکات بکرێت. ئەم کارانەش کاتی پێویستی پێ دەوێ، دەبێ ئەوانیش سەبرو حەوسەڵەیان هەبێ. (ئەمیلیانۆ زاپاتا) ڕووەو بەردەم نەوییەوە و گوتی:

ـ سەرۆك كۆماری من، دەبێ ئێوە بزانن كە ئێمە نانەكانمان لەگەنمەشامی وەدەست دێنین، نەك لە سەبرو حەوسەڵە. سەبر ناتوانێ لە گەمارۆدانێکی چەکداری و حەرەسدار بپەڕێتەوە. بۆ وەجێ هێنانی فەرمایشتەکانی ئێوە، یانی دەستنیشانکردنی سنورەکان ئێمە موحتاجی ئیجازەی ئێوەین تالە و گەمارۆیە بپەڕینەوە.

(دیاز) شانەکانی بەرز کردەوەو گوتی:

ـ من ناتوانم ئەم ئیجازەیە بە ئێوە بدەم.

(زاپاتا) گوتی:

ـ بەڵام خۆتان نەسیحەتی ئاوهاتان کردوین

سەرۆك كۆمار گوتی:

- من تەنها دەتوانم ڕانمایتان بکەم.

(زاپاتا) سەرێکی ڕاوەشاندو گوتی:

- ئێمەیش، بەو شێوەیەی ڕانمایت کردوین ڕەفتار دەکەین، گەلێ سوپاست دەکەم سەرۆك كۆماری من

بەرەو دوا گەڕایەوە، تالەژوورەکەی بێتە دەرێ، بەڵام سەرۆك كۆمار لە پشتی مێزەکەیەوە هەڵسا، شەپۆلی توڕەیی و غەزەب بەدەنگیا دەرکەوت و گوتی

- ناوت چییە؟

پێی وابوو بەبێ ئیحترامییەوە قسانی لەگەڵ کراوە، زاپاتا گوتی:

(ئەمیلیانۆ زاپاتا)

سەرۆك كۆمار بەتوڕەییەوە دەستی دایە قەڵەمێك لەسەر لیستی ناوی نوێنەرەکان، بازنەیێکی بەدەوری ناوەکەیدا کێشا، ئەمیلیانۆ ئەم کارەی سەرۆك كۆماری بینی، بەڵام نەوەستا، بەڵکو پشتی تێکردو کەوتە پێش نوێنەرەکان لە ژوورەکەی چووە دەرێ، پاش ئەوەی دەرگاکە بەسترا، جارێکی دی (دیاز) سەیرێکی ئەو ناوەی کرد کەبازنەیێکی بەدەوردا کێشابوو و لەژێر لێوەوە گوتی (زاپاتا ئەمیلیانۆ زاپاتا).

## ٢

لە مەسافەیێکی دوورەوە، چیا ئەرخەوانیەکان لەژێر ئاسمانی شیندا دەکەوتنە بەر چاو، لەوێدا. لە نێوان دۆڵەکاندا کەروێشکەی سەوزە گیاکان، بەدەم شەماڵی بەرەبەیانی بەهار، ڕۆحی ئینسانی دەهێنایە جۆش. زۆربەی زۆری دانیشتوانی گوندی (ئەیالا) بەرانبەر ئەو تەلبەندە بەرزەی، کە بەدەوری کۆنە زەویەکانی خۆیاندا کێشرابوو وەستابوون.

هەموویان ژن و پیاو، گەنج و پیر، بە ئاڕامیەوە چاوەڕوان بوون منالان، بە ئاسپایی و لەسەرخۆ، لەسەر ئەرزەکەدا گەمەیان دەکرد. منالێکی چکۆلە وێنەیێکی حەزرەتی مەریەمی بەستبووە قەد دارێکەوە و دارەکەیشی گرتبووە دەست.

کاتێ کە (زاپاتا) بەسواری ئەسپێکی سپییەوە دەرکەوت. لادێیەکان بەخێرهاتنەوەیان کرد. یەکێ لە پیرە مێردەکان کەناوی (لازارۆ) بوو گوتی:

ـ لە ڕۆژێکی ئاوهادا، دەبا جەژن بەرپابکرێ، بەلام تەنها ئەمەیە (ئیشارەتی بۆ خورجێکی چکۆلەی ژێر باخەڵی خۆی کرد)

ئەمیلیانۆ، زەردەی هاتێ و ئەسپەکەی بەرداو گوتی:

ـ بەڵێ هاوسێکانی من، ئەمڕۆ تەنها ئەمەیە.

لە کەناری ئەودا شەش ئەسپ سوار دەبینران، یەکێکیان (ئۆفیمۆ)ی برای و (پاپلۆ)ی چاکترین هاوڕێی بوون، گەرچی چاوانی (ئۆفیمۆ) بلاچەی شەڕ و توندی تیا دەدرەوشایەوە بەلام، سەرباری ئەمەیش برای ئەو بوو.

(پاپلۆ) پیاوێکی نەجیب و خاوەن فکربوو، گەلێ حەزی بەخوێندنەوە بوو.

(ئەمیلیانۆ) هەندێ هەڵوێستەی کرد، پاشان شانەکانی خۆی ڕاستکردەوە ئیشارەتی بۆ (ئۆفیمۆ) کرد و گوتی:

ـ گەمارۆکە بشکێنە

(ئۆفیمۆ) سەری دانەواندو گوتی:

ـ ئەمرەکەی برا.

پاشان شمشێرە کورتەکەی بەرز کردەوە، بەلێدانێکی مەحکەم تەلەکانی پساند لادێیەکان لە نێوان سیمە پساوەکە، پەڕینەوە هەموویان سەرنجی

کەسی مەسئولی سنور بەندیان دەدا، (لازارۆ) نەخشەیێکی لە خورجە چکۆلەکەی دەرهێنا، پاش ئەوەی سەرنجێکی داو گوتی:

ـ بەردی سنووره کۆنەکە دەبێ لەم دەوروبەره بێت.

ئیشارەتی بۆ لای چەپ کرد، پیرەمێردێکی دی بەناوی (ئینۆسنت) لەو شوێنە نزیك بووەوە کە (لازارۆ) ئیشارەتی بۆ کردبوو، دەستی دایە خشتێ سەرکەوتووانە گوتی:

ـ راست دەکەی ئەمەیش پارچەیێکییەتی.

یەکێ لە گەنجەکان وێنەی حەزرەتی مەریەمی گرتە دەست و داری وێنەکەی، بەمەحکەمی چەقاندە ئەو شوێنە، پاشان هەموویان بەردیان لە دەوری دارەکەدا کەڵەك کرد.

لە پڕ لە دوورەوە دەنگێکی کزی شەیپور بیسترا، لە ورتە ورت کەوتن لادێیەکان سەرنجی ئەو شوێنەیان دا کە دەنگەکەی لێوە دەهات. سەیریان کرد نزیکەی چل سەربازی ئەسپ سوار، لەسەر تەپۆلکەکەی بەرانبەریان دەرکەوتن. دەنگی شەیپور دوو بارە بیسترا، سەربازەکان هیرشیان هێنا.

(ئەمیلیانۆ) و (ئۆفیمۆ) و (پاپلۆ) بەسواری، لە درزێکی سیمە بڕاوەکە ئاو دیوو بوون، هاواریان کرد.

ـ راکەن! فیرارکەن!

کاتێ کە هەندێ لە لادێیەکان گەیشتنە (شورەکە) لە پڕ دەنگی دەستڕێژێ بیسترا چەند لادێیێك کەوتنە سەر زەوی، لە هەمان کاتدا نەڕەی سەرکردەی سەربازەکان بەر گوێ دەکەوت کە هاواری دەکرد:

ـ خۆیەتی، هەمان زاپاتایە کە دەمان ویست

ئەمیلیانۆ، جڵەوی ئەسپەکەی کێشا، ڕووەو سەربازەکان ئەسپی تاودا، هەر کە گەیشتە یەکەم سەرباز ئاوزنگی ئەسپەکەی خۆی چەقاندە قەبرغەی ئەسپی سەربازەکە، ئەسپەکە حیلاندی و سوارەکەی خۆی خست، ترسی ئەم ئەسپە. هەموو ئەسپەکانی دی گرتەوە، لە ماوەی چەند

دەقیقەییێکدا، زۆربەی ئەسپەکان سوارەکانی خۆیان هەڵدایە خوارێ. لە نێو ئەم بەزم و ڕەزمەدا، ئەو لادێیانەی بەرنەکەوتبوون، فریای خۆیان کەوتن و فیراریان کرد.

کاتێ کە سەربازەکان بەترسەوە لە دەوری یەکدی کۆبونەوە سەیریان کرد ئەمیلیانۆ زاپاتا ون بووە.

٣

ئەو کوێرە ڕێیەی کە لە دامێنی چیاکەدا بوو، گەلێ باریك بوو، مێرد منداڵەکە نەیدەتوانی بە ئاسانی لەوێوە سەوکەوێ، بەقورسییەوە هەنگاوی هەڵدەهێنا ماندوویێتییێکی زۆر نیشتبووە سەر ڕوخساری، تەنها چاوەکانی دەدرەوشانەوە، چاوە تیژ بینەکانی هیچ شتێکی نەدەبوارد، کۆتەکەی خستبووە سەر دەست، بەهەمان دەستیش کڵاوە کۆنەکەی خۆی گرتبوو. چەند دەقیقەیێك وەستا هەناسەی هاتەوە بەر، چاوی بە ئەشکەوتێ کەوت، نزیکەی سەد هەنگاوێ، لە ژوور سەریەوە بوو، دەستەکانی نایە نزیکی دەمییەوە هاواری کرد.

ـ ئەمیلیانۆ. ئەمیلیانۆ زاپاتا.

هەندێ سەیری کردو پاشان کەوتە ڕێ، زوو زوو بە پشتی دەست عارقی ڕوخساری دەسڕییەوە.

ئەمیلیانۆ و ئۆفیمۆی برای چوونە نێو چاڵێکی نزیك ئەشکەوتەکە، سەیری ئەویان دەکرد. روخساریان چڵکن و ژێر چاوانیان بازنەیێکی ڕەشهەڵگەڕاوی پێوە دیار بوو، پۆشاکەکانیان قوڕاوی و چرچ بوون نزیکەی مانگێ دەبوو لە ترسی سەربازەکان ڕایان کردبوو، پەنایان بۆ ئەم ئەشکەوتە هێنابوو، مێرد منداڵە لاوازەکە بەرەوژوور دەچوو، کە پەنجا هەنگاوی مابوو بگاتە ئەشکەوتەکە، ژاپاتا ئیشارەتی بۆ براکەی کرد،

ئۆفیمۆ ئاگری بەردایە تفەنگە کۆنەکەی خۆی و گوللەیێك لەبەر پێی مێردمنداڵەکە، تۆزێ لە زەوی هەڵسان، هەندێ بەرەو پاش خزا، پاشان کەوتەوە ڕێ، ئەمیلیانۆ گەڕایەوە، سەیری ئەو ژنە لادێیەی کرد کە لەبەردەم ئەشکەوتەکەدا خەریکی برژاندنی گۆشتی شکاربوو، تەمەنی بە دروستی مەعلوم نەبوو، بەڵام جوانییێکی سادە بەروخساریەوە بوو، بە ئارامی و یەك ڕیتم دەجولایەوە. لەو کاتەدا پاپلۆ لە ئەشکەوتەکە هاتە دەر، ژنەکەی سەری بەرز کردەو و بزەیێکی بۆ کرد، ژنەکە ناوی (سلدادرا) بوو بە پاپلۆی کوت:

ـ مێردەکەم... چاك خەوتی؟

ـ چاك خەوتم. بەڵام نەك بەرادەی پێویست.

پاشان بەرەو لای ئۆفیمۆ و ئەمیلیانۆ چوو پرسی:

ـ دەنگی ئەو تەقەیە لە کوێوە بوو.

ئەمیلیانۆ بە پەنجەی ئیشارەتی ڕووەو مێردمناڵەکە کردو هەرسێکیان سەرنجی ئەویان دەدا، ئۆفیمۆ گوتی:

ـ هێشتا دەیەوێ بێت.

ئەمیلیانۆ لە چاڵەکە هاتەدەر و هاواری لێکرد:

ـ چیت دەوێ؟

مێردمناڵەکە بەرەو لای پاپلۆ چوو، چونکە دەیبینی ئۆفیمۆ لولەی تفەنگەکەی تێکردووە، دەستەکانی بەرز کردەوەو گوتی:

ـ ناوی من فرناندۆ ئاگوئیرە

پاپلۆ، تەوقەی لەگەڵدا کردو گوتی:

ـ ناوی منیش پاپلۆ گومز ـ ە

فرناندۆ گوتی:

ـ من بەدووی ئەمیلیانۆ زاپاتا دەگەڕێم، خەڵکانی گوندی (ئەیالا) منیان بۆ ئێرە ناردووە.

ـ ئەو لێرە نیە؟

پاشان بە ئیشارەتێکی ئەمیلیانۆ هەموو لەشی فرناندۆیان پشکنی.

فرناندۆ گوتی:

ـ من چەکم پێ نیە.

ئۆفیمۆ بەگومانەوە ئیشارەتی بۆ تایپەکەکردو پرسیی:

ـ ئەمە چییە؟

فرناندۆ گوتی:

ـ ئەمە تایپە، بەبارێکی دی ئەمە بە جۆرە چەکێ دەژمێردرێت. ئەمە شمشێری فکرە

ئۆفیمۆ تایپەکەی وەرگرت و ویستی بیداتە قەد بەردێکاو بیشکێنێ، فرناندۆ هاواری لێ هەڵسا

ـ شەرم ناکەی وادەتەوێ ئەمە بشکێنی، لێگەڕێو لەسەر زەویەکەدا داینی

هەر کە ئەمیلیانۆ قسەی کرد، فرناندۆ حاڵی بوو، کە ئەوەی بەدوایدا دەگەڕێ دۆزیویەتەوەو بۆیە گوتی:

ـ تۆ ئەمیلیانۆ زاپاتای. من لەلایەن ڕابەری میللەت. فرانسیسکۆ ماردۆ کە دژ بە (دیاز) دەجەنگێ نێردراوم. هەواڵم بۆ هێناوی، من تونیمە و دەمەوێ لەگەڵ ئیوەدا قسان بکەم.

ئەمیلیانۆ گۆزە ئاوێکی دایێ، فرناندۆ چۆکی دایە سەر زەوی بەتونییەتیێکی سەیرەوە ئاوەکەی خواردەوە، پاش ئاو خواردنەوە هەڵساو دووبارە گوتی:

ـ دەمەوێ قسەت لەگەڵدا بکەم.

بەڵام ئەمیلیانۆ بەرەو ئەسپە سپییەکەی چوو، کە لەگەڵ دوو ئەسپی دیدا لەنزیك دەمی ئەشکەوتەکەدا بەسترابونەوە وادەکەوتە بەرچاو چ بایەخێ بە قسەکانی نادات، فرناندۆ گوتی:

ـ ئێستا....

فرناندۆ کارتۆنە چکۆلەکەی کردەوە دەستەیێك کاغەزی تیا دەرهێناو گوتی:

ـ دەمەوێ قسەکانی فرانسیسکۆ ماردۆ ـ ت بۆ بخوێنمەوە

دەستی بەخوێندنەوەی یەکێ لە کاغەزەکان کرد

(زوڵم و زۆری پوفیریودیاز، لە ڕادەبەدەرە و تەحەموول ناکرێ، سیو چوار ساڵ زیاترە بە ئەوپەڕی بێڕەحمی حوکمڕانی مەکسیك دەکات)

هەندێ وەستا، ئەمیلیانۆ کاغەزەکەی لە دەست وەرگرت و بەدیقەتەوە سەرنجی وێنەکەی مادرۆ ـ ی دا کە لە گۆشەی کاغەزەکەدا چاپ کرابوو، گوتی:

ـ قەلافەتیم بەدڵە

پاشان کاغەزەکەی پێچایەوەو خستیە گیرفانی، پاپلۆ گوێبیستی قسەکانیان بوو پرسی:

ـ ئێستا مادرۆ لە کوێیە؟

فرناندۆ گوتی:

ـ ئەو، ئێستا لە ئەمریکادایە و لە شوێنێکە بەناوی تەکساس و خەریکە کاروباری هێرش بردن ئامادە دەکات، بەڵام ئەو گەلێ پێویستی بەرابەرانی خۆی هەیە، هەر لەبەر ئەمەیشە بۆ گفتوکۆ لەگەڵ ئەمیلیانۆ زاپاتا، من بۆ ئێرە هاتووم، خەڵکانی (ئەلایا) دەڵێن زاپاتا ڕابەری ئێمەیە.

ئەمیلیانۆ ڕووەو ئاگرەکە چوو، پارچە گۆشتێکی برژاوی شکارەکەی

هەڵگرت و دایەدەستی فرناندۆ و گوتی:

ـ هەرشتێك دەبیستی باوەڕ مەکە، من ڕابەرنیم، من کەسێکم دەمەوێ تەنهاییەکەم بێ سەرپێچی و سەرئێشە بگوزەرێنم، گۆشتەکە بخۆو هێز پەیدا بکە.

کاتێ کە فرناندۆ مژولی گۆشت خواردن بوو، پاپلۆ بەرەو لای زاپاتا چوو زاپاتاش سەرنجی سمی ئەسپەکەی دەدا، ئەمیلیانۆ بەوروژانەوە سەری خۆی بەرزکردەوەو گوتی:

ـ مادرۆ ـ فرانسیسکۆ مادرۆ. چ ناوێکی جوانی هەیە. من کەیفم بەجۆری سەرنجەکەی دێ، گەلێ مەیل دەکەم قسانی لەگەڵدا بکەم.

پاپلۆ گوتی:

ـ کەوابێ بچۆ بۆ تەکساس و قسانی ـ لەگەڵدا بکە

وروژانەکەی روخساری ئەمیلیانۆ خامۆش ببووەوە، دیارە مژولی سەرنج دانی سمی ئەسپەکەی بوو و گوتی:

ـ نەء.. ناتوانم.. من نەخشەی دیم لە مێشکدایە

پاپلۆ بەبێزاریەوە گوتی:

ـ تۆ هیچ نەخشەیێکت نیە، تۆ تەنها لە فکری ئەو کچەدای. ژۆزفائەسپژو، تۆی خۆش ناوێت، ئەمە تەنها نەخشەی تۆیە

ئەمیلیانۆ بەرەو لای پاپلۆ خۆی چەماندەوەو بە ئەسپایی گوتی:

ـ من مەیل دەکەم تۆ بچیتە لای ماردۆ و سەرنجی روخساری بدەی پاشان پێم بڵێی چیت دیوە، وێنە هێچ شتێك نیشان نادات.

پاپلۆ بەسەر سوڕمانەوە گوتی:

ـ من؟ من بڕۆم بۆ تەکساس؟

ـ بەڵێ. دەبێ تۆ بۆ تەکساس بچیت.

پاپلۆ گوتی:

ـ من لە هەموو تەمەنمدا هەرگیز نەچوومەتە دەرێی (مورەلوس)

ئەمیلیانۆ گوتی:

ـ بەڵام دەبێ ئێستا بڕۆیت و مادرۆ ببینی، بزانە دەتوانین ئیعتمادی بکەینە سەر یا نەء؟

پاپلۆ ئاهێکی هەڵکێشاو ڕووەو ئەسپەکەی خۆی چوو. بێ ئەوەی لاکاتە لاوە سواری ئەسپەکەی بوو، بەرەو خوار لە شاخەکە هاتە خوارێ، ئەمیلیانۆ بەرەو لای ئاگرەکە چوو پارچە گۆشتێکی هەڵگرت بەتێفکرینەوە مژولی جاوینی گۆشتەکە بوو

فرناندۆ پرسی:

ـ پاپلۆ بۆ کوێ چوو؟

ـ نازانم بەمنی نەگوت.

دوا پارچە گۆشتەکەی قوت دا، بەرەو ئەسپە سپییەکەی خۆی چوو و سوار بوو بەرێی پێچەوانەی پاپلۆ کەوتە ڕێ. فرناندۆ بەسەر سوڕمانەوە گوتی.

ـ ئەمیش ڕۆیشت.. بۆ کوێ؟

ئۆفیمۆ، بزەیێکی هاتێ و بەلاسایی کردنەوەی دەنگی براکەی، گوتی:

ـ نازانم بەمنی نەگوت

فرناندۆ پرسیی:

ـ مەبەستی چ بووە؟

ئۆفیمۆ بەرەو دوا ئەسپ ڕۆیشت و سوار بوو گوتی:

ـ ژنێك ...ئەمە چ پرسیارێکە؟

فرناندۆ پرسیی

ـ تۆ بۆ کوێ دەچیت؟

ئۆفیمۆ دایە قاقای پێکەنین و گوتی

ـ ژنێك... ئەمە چ پرسیارێکە

بەدوای براکەی دا ئەسپی تاودا.

## ٤

ئۆفیمۆ گەلێ حەزی لەژنان بوو، بەڵام بۆ ئەمیلیانۆی برای تەنها ژنێك وجودی هەبوو ئەویش (ژۆزفا ئەسپیژو) بوو، ژۆزفایێك کە زولفە رەشەکانی لەبەر تیشکی هەتاودا دەدرەوشانەوە، ژوزفاییێك کە لێوانی سور و رێك بوون ژۆزفاییێك کە بەرێدا دەرۆیشت هەموو ئەندامە رێکەکانی لەشی وەك ساقەی گەنمەشامی لەبەر بای پایزدا دەلەرییەوەو بەسەر زەویدا دەخزا، هەرکاتێ ئەمیلیانۆ لە کۆڵانەکانی (ئەیالا)دا رووبەرووی بوایێ، هەزاران ئومێدو ئارەزووی دەبەستە قەد زەردەخەنەکەی خۆیەوە بەڵام ژۆزفا هیچ کاتێ وەڵامی نەدەدایەوە.

لەچەژناندا، ئەمیلیانۆ تەنها لەبەر خاتری ژۆزفا جلیتان بازی دەکرد ئەگەر چی چاکترین سواری دێ بوو کەچی ژۆزفا لەگەڵ سوارانی دی کە لە ئاستی سوارچاکی ئەمدانەبوون سەمای دەکرد، ئەمیلیانۆ دەیزانی باوکی ژۆزفا قایل نابێت و نایداتێ سینیور ئەسپیژۆ گوتبووی کە تەنها تەڵە موویێکی سەری کچەکەی سەری زاپاتا دەهێنێ، کە دایکی لە سالازاریەکان و باوکی سەرۆك عەشیرەتێکی پێست سورانە، ئەوەی کە سینیۆر ئەسپیژۆ گوتبووی راست بوو چونکە ئەمیلیانۆ نە زەوی هەبوو نە پارە و نە کەسوکار. داخوازی کردنی ژۆزفا کارێکی بێهودە بوو بەڵام ئەم خەون و ئارەزووە هەمیشە لە دڵی ئەمیلیانۆدا دەدرەوشانەوە.

ئەمیلیانۆ و ئۆفیمۆ بەسواری لە چیا هاتنە خوارێ، ئەسپەکەیان لە بێشەیێکی نزیکی دێدا بەستەوە پاشان چوونە، نێو گوندی ئارام و بێدەنگ، ئەمە کارێکی خەتەرناك بوو، سەربازەکانی مورەلوس، بەدووی ئەواندا دەسورانەوە، بەڵام کاتێ کە ئەوان گەیشتنە نێو ئاوایی، خۆرئاوابوو، کۆڵانەکانی دێ چۆڵ ببوون، ئەمیلیانۆ دەیزانی لەم کاتەدا ژۆزفا و پورەکەی لە کڵێسا چکۆلەکەی دێدا، مژولی نوێژ خوێندنن.

ئەمیلیانۆ و ئۆفیمۆ بە ئاسپایی دەرگای گلێسەکەیان کردەوە، تفەنگەکانیان نایە قەد دیوار و بە بێدەنگییەوە لە ملاو ئەولای ژۆزفا و پورەکەیدا دانیشتن هەرچەندە کلێساکە کەسی دیی تیادا نەبو، بەڵام ئۆفیمۆ بۆ ئیحتیات دەستی نایە سەردەمی پیرێژن، چونکە مومکین بوو هاوار بکات، وانەدەهاتە بەرچاو ژۆزفا راچڵەکی بێ و یاسەری لەم کارە سورمابێ.

کە ئەمیلیانۆ رازی دڵی هەڵرشت، ژۆزفا پێی گوت، بە بیریدا نەهاتووە شو بەیاخی و فرار بکات و ژیان لەئەشکەوتدا بگوزەرێنێ، تەنانەت کە ئەمیلیانۆ ئەوەشی پێ گوت کە بەتەمایە لەلای (دۆن ناسیۆ) کار بکات، ئاگاداری تەویلە و ئەسپەکانی بکات ئەم کارەش لە تاقیبکردنی سەربازەکان دووری دەخاتەوە، کەچی ژۆزفا بایەخی نەدایێ.

ژۆزڤا گوتی، خۆت و براکەت یاخی و رێگرن، کلێسا جێ بێڵن و لێگەرێن خۆم و پورەکەم نوێژەکانمان تەواو کەین.

ئەمیلیانۆ هەستی کرد روخساری سوور هەڵگەراوە ئیشارەتی دایە ئۆفیمۆ دەسبەرداری پورەکەی بێت، پاشان لەجێ هەڵسان و بەیەکەوە کلێسایان جێ هێشت.

پاشان ئەو دووە دەرگای کلێسایان لە پشتی خۆیانەوە داخست ژۆزفا و پورەکەی سەیری یەکدیان کرد و پاشان پورەکەی گوتی:

ـ من ئەوم بە دڵە

ژۆزفا پرسی

بەراستە؟

پورەکەی سەری خۆی ڕاوەشاندو گوتی

ـ بەڵام بەچاکیشی دەزانم، ئەو یاخی و فیرار و تاوانکار بۆ ژنهێنانی یەکێ لە بنەماڵە موحتەرەمەکان موناسیب نیە.

ژۆزفا زەردەخەنەیێك سەر لێوانی گەشانەوە، دەستی پورەکەی گوشی و پێی گوت

ـ منیش ئەوم بە دڵە..

٥

ئەمیلیانۆ لە تەویلەکەی (دۆن ناسیۆ) کاری دەکرد، هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوە سەربازەکان دەست لە تاقیبکردنی هەڵگرن، ئەو بەجوانی کاری دەکرد گەلێ ئەسپی چاکی بۆ (دۆن ناسیۆ) کڕی، دۆن ناسیۆش گەلێکی لێ ڕازی بوو ئەمیلیانۆ گەلێ دۆن ناسیۆی خۆش دەویست چونکە پیرەمێردێکی دڵ پاك بوو ئەگەر چی بنەماڵەکەیان لە کوڵکدارە گەورەکانی مورەلوس بوو بەڵام دۆن ناسیۆ لادێیە پێست سورەکانی خۆشدەویست و ڕەفتاری چاکەی لەگەڵیاندا دەکرد.

بۆ ماوەیێکی کەم، ئەمیلیانۆ، تەقریبا خۆشبەخت بوو، ڕۆژێ (سینیۆر ئەسپیژۆ)ی باوکی ژۆزفا لە کۆلانێکدا بینی، ئەگەر چی ئەسپیژۆ ڕەفتاری دۆستانەی لەگەڵدا نەنواند، بەڵام بەسوکیشەوە سەیری نەکرد، ئەڵبەتە جارجارێکیش، هەندێ ڕوداوو پێشهات، ڕووی دەدا بۆ نمونە ڕۆژێ ئەمیلیانۆ ناچار بوو لەگەڵ مەیتەری ئەسپەکاندا شەڕە کوتەك بکات،

ئەمیلیانۆ حەزی لە بیچمی مەیتەرەکە نەدەکرد، ڕۆژێ مەیتەرەکە کوڕێکی چکۆلەی پێست سووری خستە ژێر چەکمەکانی خۆیەوە و لێی دا منالّە بێنەواکە برسی بوو هەندێ لە ئالّفی ئەسپەکانی خواردبوو، ئەمیلیانۆ ناچار بوو لەسەری بێتە دەنگ، مەیتەرەکەی دایە سەر زەوی، ئەگەر دۆن ناسیۆ فریای نەکەوتبا، ڕەنگ بوو بیکوشتبا.

ئەمیلیانۆ حەزی دەکرد هیچ کاتێ تووشی دەردە سەری نەبێت بە ڕێکوپێکی کارەکانی ئەنجام دەدا، ڕۆژێ پاپلۆ لە تەکساس گەڕایەوە، فرناندۆ ئاکوئیر ـ ی لەگەڵدا بوو، کاتێ کە فرناندۆ و ئۆفیمۆ گەیشتنە نێوباغەکەی (دۆن ناسیۆ) ئەمیلیانۆ هەموو پەیمانەکانی خۆی فەرامۆش کرد، ئەسپە سپییەکەی کەناوی (پلانکۆ) بوو، زین کرد، هەرسێکیان لە باغەکە چوونە دەرێ، ماوەیێك ئەسپیان تاودا تا گەیشتنە جێیەکی موناسیب بۆ قسەکردن.

ناوبانگی (فرانسیسکۆ) لە هەموو مەکسیکدا بلاّوبووەوە ناوهێنانیشی گەلێ ترسناك بوو. لە بێشەیێکدا کە ڕووبارێکی بەنێودا تێدەپەڕی وەستان کاتێ کە ئەسپەکان خەریکی ئاو خواردنەوە

بوون، ئەمیلیانۆ باوەشی بە پاپلۆدا کردو گوتی:

ـ لێگەڕێ بابتبینم، لێگەڕێ بزانم لە تەکساسدا چ ڕفتارێکیان لەگەڵدا کردی پاپلۆ پێکەنی و ئەمیلیانۆی ماچ کرد.

ئەمیلیانۆ گوتی:

ـ ئێستا دەربارەی فرانسیسکۆ ماردۆ قسانم بۆ بکە

ـ چاکە، ئەو پیاوێکی کەڵەگەت نیە، ڕیشێکی خورمایی هەیە دەنگی ناسك و لەسەرخۆیە.

ئۆفیمۆ بەتەوسەوە پێکەنی و گوتی:

ـ وانایێتە بەرچاو کە پیاوێکی جەنگاوەر بێت.

فرناندۆ چەمی بووەوە لەسەر لمەکاندا بە پارچە داریٚ نەخشەی دەکێشا سەری بەرز کردەوەو گوتی:

ـ ئەو پیاوێکی خاوەن قسەو ئازایە، من دەزانم کە ئەو ئازایە.

پاپلۆ بە ئاسپایی گوتی:

ـ ئەمیلیانۆ ئێمە دەربارەی تۆ لەگەڵ ئەودا قسانمان کرد.

فرناندۆ هێشتا دارەکەی بەدەستەوە بوو، هەربەدارەکە ئیشارەتی بۆ زاپاتا کردو گوتی:

ـ ئەو چاوەڕێی پەیامی ئێوەیە

ئەمیلیانۆ وەڵامی نەدایەوە، فرناندۆ بەردەوام بوو.

ـ کاتی تێکۆشان هاتووە، ئەگەر لە باکور یا لە باشوورەوە گوشار بۆ (دیاز) بهێنرێت، ئەوا وەك گایێك شمشێری بەرکەوتبیٚ، دەکەوێت.

ئەمیلیانۆ وەك هەمیشە پەشێوو دەسەوەسان دەبوو سەیری سیمەکانی (پلانکۆ)ی دەکرد، وەك ئەوەی کەسی لە تەنیشتەوە نەبیٚ منگە منگی کرد

ـ لەسەرخۆ پلانکۆ، لەسەرخۆ.

فرناندۆ دووبارەی کردەوە

ـ مادرۆ چاوەڕیٚ پەیامی ئێوەیە.

ئەمیلیانۆ بەر لەوەی وەڵامی بداتەوە، ماوەیێك بیدەنگ بوو، بە زەحمەت دەیتوانی دەست بەسەر پەشێوی خۆیدا بگریٚ، کاتیٚ کە قسەکانی دەکرد، دەیزانی چ دەڵیٚ، گوتی:

ـ پێی بڵیٚ باکەسێکی دی پەیدا بکات، من ئێستا کارێکی موناسیبم هەیەو دەمەویٚ لە ئاشوب و بەڵا دوورکەومەوە.

فرناندۆ چاوە درەوشاوەکانی خۆی چەقاندە سەر ئەمیلیانۆ و گوتی:

ـ گەلیٚ چاکە تێگەیشتم

کاتێ کە ئەمیلیانۆ، پاپلۆ، ئۆفیمۆ، دوور کەوتنەوە فرناندۆ سەیری ئەو نەخشەیەی کرد کەلەسەر لمەکاندا کێشابووی، پاشان بەپێیەکانی سڕییەوە، پارچە دارەکەی دەستی خۆی بەتورەبونێکی لەڕادەبەدەر هەڵدایە نێو روبارەکە.

٦

ناوی (ئینۆسنت) لەم ڕۆژانەدا تەقریبا لەبیر چووەتەوە، تەنها پیرەمێردەکان رەنگە بەزەحمەت قەدوبالای ئەویان، وەبیربێتەوە.تەنانەت روداوەکەی پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە گەلێ بەبێ بایەخی کەوتووەتەڕوو.

بەڵام دەبێ ناوی ئەو لەبیر نەچێتەوە، هەمان (ئینۆسنت)ە کە خشتی سنوور بەندییە کۆنەکەی زەوی جوتیارانی (ئەیالا)ی دۆزییەوە، لە کۆتایشدا هەر هەمان ئینۆسنت بو کە بەبێ ئەوەی خۆی پێی بزانێ، ئەمیلیانۆ زاپاتای کردە ڕابەری میللەتی مەکسیك.

رەنگە سەعاتە ڕێیەکیان بەسواری بڕیبێ، ئەمیلیانۆ و ئۆفیمۆ و پاپلۆ لەسەرە خۆ دەڕۆیشتن، گەیشتنە دوو سەرباز گوریسیان کردبووە گەردنی (ئینۆسنت) ئەو سەری گوریسەکەشیان بەزینی ئەسپی یەکێ لە سەربازەکان بەستبووەوە، هەردو دەستی ئینۆسنت ـ یان لە پشتەوە بەستبوو، ڕوخساریشی لەبەر عارەق و تەپ و تۆز بۆر ببوو، شوێنی لێدان بەروخسارییەوە دیاربوو، هەندێ لە پاش ئەوانیشەوە ژنەکەی بە کڵۆڵی دەبینرا، ئەمیلیانۆ، ئۆفیمۆ و پاپلۆ گەیشتنە سەربازەکان، ئەمیلیانۆ پرسیی:

ـ (ئینۆسنت) بۆچی تۆیان گرتووە؟

ئینۆسنت دەیویست وەڵام بداتەوە نەیتوانی تەنانەت بۆی نەکرا سەریشی بەرزکاتەوە ئەمیلیانۆ بەتوڕەبونەوە ڕووی لەسەربازەکان کردو گوتی:

ــ چی کردووە؟

یەکێ لە سەربازەکان بەبێ بایەخییەوە گوتی؟

ـ کێ دەزانێ. ئەو سوور پێستانە هەمیشە یەك کارێ دەکەن

ئەمیلیانۆ بەدەنگێکی ئارامەوە فەرمانی دایێ

ـ لێگەڕێن، ئازادی کەن.

ئەو سەربازە کە گوریسەکەی گەردنی ئینۆسنت بەزینی ئەسپەکەیەوە بەسترابووە، لە بری وەڵام دانەوە، ئاوزەنگی لێدا، لە ئەنجامی تەکانێکی توندی ئەسپەکە، ئینۆسنت بەدەما کەوت، ئەمیلیانۆ بێ ئەوەی چ قسەیێك بکات، شمشێرە کورتەکەی دەرهێناو تا گوریسەکە بپسێنێ، بەڵام لەپڕ سەربازەکە، ئەسپەکەی خۆی تاودا، ئینۆسنتی بەسەر زەویدا ڕاکێشا، سەربازی دووەمیش بەدوای ئەویدیدا ئەسپی تاودا، ئەمیلیانۆش شمشێرەکەی ڕاوەشان بەدویاندا ئەسپی تاودا، هەر کە گەیشتە سەربازی یەکەم بەشمشێر گوریسەکەی پساند و ئینۆسنتی ئازاد کرد.

هەردوو سەربازەکە بەرەو بێشە تێیان قوچاند، ئەمیلیانۆ لە ئەسپەکەی دابەزی ژنەکەی ئینۆسنتیش نزیکی مێردەکەی بووەوە، بەبێ گریەوزاری جەستەی مێردەکەی هەڵگەڕانەوەو، هەر لەم کاتەدا بوو لە کەلەکانی پشتی بێشەکەوە جوتیارەکان دەرکەوتن، هەندێکیان دوعایان دەخوێند، هەندێکی دییان بە چاوانی پڕ هیوا سەرنجی ئەمیلیانۆیان دەدا، بەڵام ئەو هیچی نەدەگوت، تەنها دەنگی ژنەکەی (ئینۆسنت)ی بەرگوێ دەکەوت کە قسانی لەگەڵ جەستەی مێردەکەیدا دەکرد.

(ئاگادارم کردی تۆ نەدەتوانی ئەم کارە بکەی، ئیتر زەوی هی ئێمەنیە، تەنانەت کە (پلوتارکۆ)ی کوڕەکەمانیان کوشت، تۆ بۆ زەوی کێڵان

چوویت ـ تۆ خۆشباوەربووی بەڵێ تۆ پیاوێکی خۆش باوەرو ساویلکە بووی).

لازارۆ لەنێوان جوتیارەکاندا بوو بەئاسپایی گوتی:

ـ نەء ئەو ساویلکە نەبو. زەوی وەکو ژنی پیاو وایە، ژن هەموو تەمەنی لەگەڵ مێردەکەیدا دەباتە سەر، بەڵام پیاو هەرگیز تێناگات کە ژنەکەی ئیتر هی ئەونیە، پاشان دەستی خستە سەرشانی ئەمیلیانۆ وەك باوکێ نەسیحەتی کرد.

ـ ئێستا هەموو سەربازەکان تاقیبی تۆ دەکەن، دەبێ تۆ بێیت و لە ماڵەکەی مندا خۆ بشاریتەوە.

ئەمیلیانۆ شەبقەکەی لەسەر خۆ لاداو لەتەنیشتی جەستەکەدا ئەژنۆی نایە سەر زەوی کاتێ قسەی دەکرد دەنگی دەلەرزی.

ـ ئینۆسنت گەلێ بەداخەوەم، من ئەم کارەم تەنها لەبەر خاتری تۆکرد.

ئەو ڕۆژە پاش نیوەڕۆ جارێکی دی ئەمیلیانۆ و ئۆفیمۆ و پاپلۆ گەڕانەوە بۆ ئەشکەوتێ، پاش چەند سەعاتێ فرناندۆ وەك هەمیشە بەقیتییەوە، لەسەر ئەسپەکەی بوو گەیشتە لایان، هەرکاتێ فرناندۆ سواری ئەسپ دەبوو، گەلێکی پێ ناخۆش و نارەحەت دەبوو، هەرکاتێکیش دادەبەزی، زەردەخەنەی سەرکەوتن دەنیشتە سەر لێوەکانی:

بە ئەمیلیانۆی گوت:

ـ فرانسیسکۆ مادرۆ کاری تێکردووی وانیە؟

بەڵام ئەمیلیانۆ سەری راتەکاند و نەیسەلماند، نزیك خۆرئاوا (سلدادرا)ی ژنی پاپلۆ هەندێ ئازوقەی لەکۆڵ نابوو، بەرەو چیاکە سەردەکەوت.

سێ شەو ڕۆژ ئەوان لە ئەشکەوتەکەدا مانەوە، ئەمیلیانۆ بڕیاری خۆی

دا، پاش دوو سەعات خەو، بەرەبەیان لەجێ هەڵسا، خۆی شۆرد و ڕیشی تاشی، سمێڵەکەی ڕێکخست، پۆشاکەکەی خاوێن کردەوەو پێیانی گوت، نیازی وایە بۆ گوندی (ئەیالا) بڕوات، هەموویان دەیانزانی بۆ کوێ دەچێ، بەڵام چ کەسێکیان لەم ڕووەوە پرسیاریان لێنەکرد، ئەوان دەیانزانی دەیەوێ بچێتە ماڵەکەی (سینیۆر ئەسپیژۆ) داخوازی ژۆزفای کچی بکات، دەیان زانی بەم کارە ژیانی خۆی بەرەو مەترسی دەبات، لەگەڵ ئەمەشدا بێدەنگ بوون، هەموویان سەرنجیان دەدا کە چۆن لە چیاکەوە بەرەو خوار دادەبەزی.

پاش ڕۆیشتنی ئەو، چەند دەقیقەیێك، بێدەنگی دەستی بەسەر ئەشکەوتەکەدا گرت، ئەوجا ئۆفیمۆش گوتی منیش کارێکی بە پەلەم هەیە، سواری ئەسپ بوو، کەوتە دووی، پاشان پاپلۆ دابەزی، ئەوجا فرناندۆ لە کۆتایشدا نۆرە گەیشتە سەر (سلادرا) کۆڵە پشتەکەی هەڵگرت و سەرەوژێر ڕێی گرتەبەر.

٧

کاتێ ئەمیلیانۆ گەیشتە ئەو شوێنەی کە وەك عەمبارو کۆگا وابوو، لە دەرگای دا، بێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵام بێت چووە ژوورێ، لەوێدا هەندێ کارتۆنی مۆم و سابون و شتی دی کەڵەك کرابوون، ئەسپیژۆ لە پشت مێزێکی گەورەی ڕەنگبواردوودا دانیشتبوو، کاتێ کە میوانەکەی خۆی بینی، لە جێیەکەی خۆی نەبزوا، کە ئەمیلیانۆ گوتی بۆ داخوازی ژۆزفا کچی هاتووە، ئەو بەپێکەنینێکی ساردەوە گوتی، نەء، چونکە ئەمیلیانۆ کچەکەی دەکاتە سوورپێستێکی ئاسایی، ئاوازی دەنگی بەرز و ناقایل بوو، ئەمیلیانۆ گوتی:

ـ کەوابێ پیاوێکی چاوچنۆك و پارە پەرستی وەکو خۆتی بۆ پەیدا کە، تا

ببێتە فەرماندەری عەمبارو دەفتەری حیساباتی تۆیش بگرێتە دەست.

پاش ئەوەی کەلە دەرگا چووە دەرێ، بێ ئەوەی سەیری پشتەوە بکات بەتوندی دەرگاکەی ڕاکێشا.

دوو سەربازە چەکدارەکان، لە دەرێی ماڵەکەی ئەسپیژۆ چاوەڕێی ئەمیلیانۆیان دەکرد، ئەو سەربازەی کەبوونە هۆی کوشتنی ئینۆسنت لە نێوانیاندا بەدی دەکران، یەکێ لەوانە دەستی راستی ئەو دیش دەستی چەپی ئەمیلیانۆیان گرت، لە خۆشیانا دەمیان تا بناگوێ داچەقاندوو، ئیتر لە ئەمیلیانۆ نەدەترسان، ئەمە ساتێ بوو کەلەمێژە چاوەڕێیان دەکرد یەکێ لەو دوو سەربازە دەستەکانی ئەمیلیانۆی لەپشتەوە بەست و ئەوی دیش گوریسێکی نایە گەردنی و سەری گوریسەکەی بەستە قەد زینی ئەسپی فەرماندەی سەربازەکان، ئەو کەسەی کە گوریسی گەردنی (ئینۆسنت)ی کێشابوو و ببووە هۆی مەرگی ئینۆسنت، گوتی:

ـ ئینۆسنتی بەدبەخت مرد، ئێستا نۆرەی ئەمیلیانۆی بەدبەختە هەندێ بێدەنگ بوو و، پاشان بەردەوام بوو گوتی:

ـ ئەمیلیانۆ زاپاتا؟

پرسیارەکەی بە ناتەواوی مایەوە، پێکەنینێکی گەن کەوتە سەر لێوانی، فەرماندەی سەربازەکان، سواری ئەسپەکەی بوو، ئیشارەتی دایە ئەوانی دیی تابکەونە رێ لە هەرلایەکی ئەمیلیانۆدا شەش سەرباز ڕێیان گرتبووەبەر و فەرماندەش راهنماییانی دەکردن.

هێشتا چەند هەنگاوێ نەرۆیشتبوون هەندێ جوتیار لە مەیدانی گوندەکەدا دەرکەوتن، ئۆفیمۆو پاپلۆو فرناندۆ لەنێوان ئەواندا بوون، کاتێ ئۆفیمۆ براکەی بەم شێوەیە بینی دەمی نایە پەناگوێی پاپلۆ و شتێکی پێ گوت، پاپلۆش قسەکەی بە فرناندۆ گەیاند، فرناندۆش بەنزیکترین جوتیارێ کەلە تەنیشتی بوو قسەکەی گەیاند، پاشان ئۆفیمۆو

پاپلۆو فرناندۆ بەپەلە دور کەوتنەوە، بەڵام جوتیارەکان بەبێ بایەخی و لەسەرخۆ کەوتنە دوای سەربازەکان، کاتێ کە زیندانی و سەربازەکان گەیشتنە کێڵگەیێك ـ کەمایەی ناکۆکی جوتیارەکان بوو ـ فەرماندە چاوی بەهەندێ جوتیاری دی کەوت لەبەردەمیانەوە دەرکەوتن، فەرماندە سەیرێکی پشتەوەی کرد بینی ژمارەی جوتیارەکان زیاتر بوون و بە دوویانەوەن، سەرەڕای ئەمەیش لەگردەکەی لای چەپییەوە هەندێکی دی دەرکەوتن بەرەو پێش دەهاتن، چەند سەد مەترێکیش لە خوارووی جادەکەدا ئۆفیمۆ ڕەشمەی ئەسپەکەی ئەمیلیانۆی بەدەستەوە بوو لەگەڵ پاپلۆو فرناندۆ زیاتر لەدوانزە چەکداری دیش وەستابوون.

فەرماندە دەستووری وەستانی داو هاواری کرد:

ـ ڕێیەکە بکەنەوە.

هیچ کەسێ وەڵامی نەدایەوە و چ کەسێکیش نەچووە کەنارەوە، فەرماندە لەسەر زینەکەی خۆی ڕاست کردەوەو گوتی:

ـ ئەم پیاوە تاوانبارە، ئێوەش بەم کارەتان بەهاوبەشی تاوانی ئەو دەژمێردرێن.

وەکو ئەوەی کەسێ گوێی لە قسەکانی نەبێ، ورتە لە دەمی کەسەوە نەهاتەدەر فەرماندە سەیرێکی سوارەکان و پیادەکانی کرد کەوردە وردە لەدەوری سەربازەکان کۆدەبنەوە، گوتی:

ـ دەتانەوێ چ بکەن؟

پیرەمێردێ کەناوی لازارۆ بوو، هەنگاوێك هاتە پێشەوەو گوتی:

ـ جەنابی ڕەئیس، ئێمە دەمانەوێ دڵنیابین کە زیندانییەکە فیرارناکات، چونکە ئەگەر نیازی فیرارکردنی هەبێت، ئەوا ئێوە لە پشتەوە دەیدەنە بەر گوللە وانیە جەنابی سەرۆك؟

فەرمانده بەتوڕەییەوەو لەسەریەك پەنجەی دەکێشایە قەد زینەکە، کاتێ

که دەستی بە قسان کرد دەنگی دەلەرزییەوە، گوتی:

ـ ئێوە دەتانەوێ سەرپێچی لەقانون بکەن.

لازارۆ، سەری راتەکاندو گوتی:

ـ کەیفی خۆتانە، ئێمە بەیارمەتی ئێوە بۆ وەجێ هێنانی قانون یاریدە دەدەین، ئێمە زیندانیەکەمان دەپارێزین.

فەرماندە ساتێ بێدەنگ بوو، دەیویست قسان بکات (سلدادرا) لەنێوان خەڵکەکەوە هاتە دەرێ، بەدوو دڵییەوە سەیری دەکردو دەستوریدا.

ـ لەئەسپەکە دابەزە.

بێدەنگی دەستی بەسەردا گرتن، فەرماندە لە ئەسپەکە دابەزی، گوریسەکەی لەزینی ئەسپەکە کردەوە، زۆر بەئاراممییەوە دەجوڵایەوە لە ترسانا دەستەکانی دەلەرزین، گوریسەکە کەوتە سەرزەوی یەکێ لە جوتیارەکان بەچەقۆ گوریسەکەی ئەمیلیانۆی بچراند پاشان ئەمیلیانۆ ئەلقەی گوریسەکەی لە گەردنی خۆی داماڵی خستیە سەرزەوی، بەبێ ئەوەی سەرنجی فەرماندە بدات، بەتەنیشتیا تێپەڕی بەرەو لای ئۆفیمۆ چوو (پلانکۆ)ی لەدەست وەرگرت، ئەمیلیانۆ سوار بوو، ویستی ببزوێ، دەنگی فرناندۆ بەرز بووەوە.

ـ (زاپاتا)

ئەمیلیانۆ سەرنجی ئەوی دا، فرناندۆ گوتی:

ـ بەرلەوەی سەربازەکان ڕووداوەکە بەتەلەگراف بنێرن، سیمی تەلەگرافەکە بپسێنن.

ئۆفیمۆ شمشێرە کورتەکەی هەڵکێشا، لەو شوێنەی کە دەستی بەسیمەکە دەگەیشت بەرەو ئەوێ چوو، فەرماندەی سەربازەکان لەنیازیان گەیشتبوو خۆی قیتەوە کرد گوتی:

ـ دەست لە سیمەکان مەدەن ئەم کارە یاخی بوونە، دژ بەدەوڵەتە

ئەمیلیانۆ دوو دڵ بوو، ئەو دەیزانی گەر سیمەکان بپسێنن ئەوا ڕێی گەڕانەوە لە خۆی دەبڕێ. هیچ یەکێ لەوانیش توانای ئەوەی نەبوو پاش ڕووداوەکە بەرەو ماڵ و ژیانی خۆی بگەڕێتەوە. ئەمیلیانۆ سەرنجی جوتیارەکانی دا، ئەوانیش ڕوخساری پڕ ئومێدیان بڕی بووە، ئەمیلیانۆ. پاشان بەبراکەی گوت:

ـ بیپسێنە.

سیمەکان بە شمشێرەکەی ئۆفیمۆ پسان لەسەر زەویدا پەرت بوون.

## ٨

هەندێ دەیانگوت بۆ خەبات کردن دواکەوتوون و درەنگە، هەندێکیش باوەڕیان وابوو، کە هێشتا کاتی نەهاتووە، هەندێکی دی دەیانگوت ئێستا وەرزی جەنگ و پێك دادان نیە، منگەمنگیان دەرکرد و دەیانگوت دەبێ تا زستان سەبر بکەن، لە زستاندا کە سارد دەبێ چاکتر خەباتیان جۆش دەدرێ، چەند کەسێکی دی بەهاریان پێ چاکتربوو، هەندێکی دیان پێشنیاریان دەکرد پایز هەڵبژێرن، بەڵام کاتێ کەلە (ئەیالا)دا جۆش و خرۆشی جەماوەری گەیشتە پۆپە، ئەمیلیانۆ زاپاتا پیاوانی خۆی بۆ جەنگ ئامادە کرد، ژەنراڵ پورفیرویودیاز لە شاری مەکسیکۆ، دەستوری دایە مەئمورکانی خۆی.

تریفەی زیوینی مانگ بەسەر باغەکەی دۆن ناسیۆدا پان ببوەوە لە پشتی دار مۆزەکانەوە ئۆرکسترێکی چکۆلە مژولی ساز ژەنین بوون، لەنێو باغەکەدا مێزێکی گەورەی جوان دانرابو، دۆن ناسیۆ و دوو کەسی دی لەگەڵ ژنەکانیان لەپشتی مێزەکەدا دانیشتبوون، یەکێ لە پیاوەکان

(ژەنـراڵ فـۆنـتس) بـوو، ئـەنـدامـە درشتـەکـانـی لـەشی لـەنێو ئـونـیفـورمـی سەربـازیدا پۆشرابـوو چـەند میدالـیـایێکی جـۆراو جـۆر بـەسەر سینـگیـەوە بوون، یەکێ لەو میدالانە خاجی ئاسن بوو، پیاوەکەی تەنیشتی یەکێ بوو لە موڵك دارە گەورەکان، ناوی (دۆن گارسیا) بوو، ڕیشی چرو چرچێکی لەرادەبەدەر بەروخساریەوە بوو، ژنەکانی ئەم دووانە پیرو کەمدو بوون، ژنەکەی دۆن ناسیۆ گەنج و جوان بوو، دۆن ناسیۆ روی گەشابووەوە و هەندێ مەست دەکەوتە بەرچاوو گوتی:

ـ ئـەم زەویـیـانـە هـی سورپـێستـانـی دەستـکـورتـە، لـە کـاتـی ئـازادی مەکسیکەوە تائێستا هی ئەوانە دەبێ زەوییەکانیان بدرێتەوە. چونکە ئیوە پێویستیتان بەو زەویانە نەماوە.

دۆن گارسیا، هەندێ توڕە بوو گوتی:

ـ تۆ مەستی، من بۆ ئەم زەوییانە پارەیێکی زۆرم خەرج کردووە و نیازم وایە سودیان لێ وەرگرم و ئەم بیابانی گەنمەشامییە بکەمە بەهەشت. ئـەمما دەربـارەی سورپـێستـان، خـۆتـان چاکتر دەزانن کە ئەم ئـاژەڵانـە چاوەڕێی ئەوەیان لێ ناکرێ سەر لەزانستی مودرنی کشتوکاڵ دەرکەن. نۆکەرێکی پێست سوور، بێ ئەوەی روخساری تێکچێ هەندێ گۆشتی نایە بەر دەستی دۆن گارسیا.. دۆن گارسیا پارویێکی دیی هەڵگرت و گوتی:

ـ با بەد حاڵی بوون نەکەوێتە نێوانەوە، سوور پێستەکان هاوسێی منن، من رقم لێیان نیە، ئەوانیش منیان خۆش دەوێ.

دۆن ناسیۆ پێکەکەی خۆی پڕکرد. دەیویست لەسەرمێزەکە داینێ، دەنگ و ورتە ورت لە گۆشە و کەناری باغەکە بەرزبووەوە، پاش چەند ساتێ هەندێ جوتیار بەشمشێرە کورتەکانیانەوە لەچوار لاوە نزیکیان بوونەوە ئـەمـیـلـیـانـۆ لـە پشتـی جـوتـیـارەکـانـەوە بـوو، دۆن گـارسیـا بـە شلـەژان و نیگەرانیەوە گوتی:

ـ چ بووە؟ ئەمانە کێن؟

دۆن ناسیۆ بەتینیوتێیکی سەیرەوە پێکەکەی هەڵداو بەزەردەخەنەوە گوتی:

ـ هەندێ لەو هاوسێیانەن کە تۆیان خۆش دەوێ.

دۆن گارسیا کۆکەیێکی کرد. هاوسەرەکەی دڵنەوایی دەدایەوە، لەم کاتەدا پاپلۆ لە تاریکییەوە هاتەدەر، بۆ ڕێزنواندن شەبقەکەی گرتبوە دەستی لەبەردەم دۆن گارسیا چەمییەوە و گوتی:

ـ ئەمیلیانۆ دەیەوێ بزانێ ئایە تا ئێستا هیچ ئەنجامێ بەدەست هاتووە یا نەء ناتوانێ لەمە زیاتر ماتڵ ببێت.

دۆن ناسیۆ بەلەتردان لەجێیەکەی هەڵساو بەمیوانەکانی گوت:

ـ ئەمیلیانۆ زاپاتا هاتە لای من و تکای کرد کە زەوی جوتیارەکان بەر لەوەی وڵات لە نێو ئاگری شۆڕشدا بسوتێت بدرێتەوە بەخاوەنەکانیان منیش تەنها کارێ کە دەمتوانی ئەنجامی بدەم ئەوە بوو ئێوەی بەڕێز دەعوەتکەم و تکاتان لێ بکەم کۆتایی بەم تراژیدیایە بێنن.

ژەنەراڵ فۆنتس جەنگاڵەکەی بەرز کردەوە و گوتی:

ـ سوپا بەزاراوەی تراژیدی ئەمە سەرکوێر دەکات، ئێستا ئەوان بەڕێوەن.

دۆن ناسیۆ بەغەمبارییەوە گوتی:

ـ ئەمیلیانۆ باوەڕت بێ من داوای سوپام نەکردووە و هیچ دەخلێکم لەم کارەدانیە.

زاپاتا بەدەنگێکی مولائیم کە حەسرەت و نائومێدی لەنێویدا شەپۆلیان دەدا گوتی:

ـ دۆن ناسیۆ خوا حافیز

قەدو باڵای لە سێبەردا نەدەبینرا، کاتێ کە قسەی کردو کەوتە ڕێ،

ژەنراڵ فۆنتس هەستی شوێنەکەی کرد، بەئارامییەوە دەستی برد و دەمانچەکەی لە کیف دەرهێنا ڕووە و پشتی ئەمیلیانۆ زاپاتا سیرەی گرت بەڵام کەویستی پەلەپیتکە بترازێنێ دۆن دەستی ئەوی بەرەو پاش کێشاو دەمانچەکە کەوتە سەر زەوی، هەر لەم کاتەدا نۆکەرە سورپێستەکە بەروانکی تایبەت بەنۆکەرانی لەبەر خۆی داکەند و لەسەر کورسییەك داینا کەوتە دوای زاپاتاوە.

دۆن ناسیۆ بە لەتردانە هەتا دەرگای باغەکە چوو، سەرنجی خۆی چەقاندە سەر تاریکییە بێ کۆتاییەکەی شەو (ژەنەراڵ فۆنتس) گوتی:

ـ بەنەجات بوونی ئەو پیاوە، تۆ ئەبیتە هۆی کوژرانی هەزاران کەس لەنێو ئەوانەشدا خودی خۆت.

دۆن ناسیۆ وەڵامی نەداوە، وەك ئەوەی چاوەڕێی بیستنی شتێ بێ، دەنگی شکاندنی دەرگایێك بیسترا، زەردەخەنەیێك لێوەکانی لە یەك جیاکردەوە، ئەمجا دەنگێکی گەورەتریان بیست، دۆن گارسیا بەترس و لەرزەوە لە جێیەکەی خۆیەوە هەڵساو پرسیی:

ـ ئەمە دەنگی چی بوو؟

دۆن ناسیۆ هەر بەزەردەخەنەوە گوتی:

ـ دەنگی شکاندنی مەشجەبەکەی من بوو.

گەرایەوە سەر مێزەکە، پێکێکی دیی گرتە دەستی گوتی:

ـ ئێستا ئەوان بوونە خاوەن چەکیش..

## ٩

ئەوان ئێستا تفەنگیان هەیە، بەڵام نەك بە ئەندازەی پێویست، فیشەکیان نەبوو، چەند دەقیقەیێك، چەند سەعاتێك، ئەو پەڕەکەی ڕۆژێ، خۆ سەربازەکانی ژەنراڵ پورفیریودیاز دەگەنە سەریان و هێرشیان بۆ دێنن، دەبا بەزوترین کات وەخۆ کەون و دەست بە کاربکەن.

دەستەیێك لەسەربازەکان گەیشتبوونە جێیەکی جادەکە، لق و پۆپی دارەکان سەریان خستبووە سەرجادەکە، لەپشتی بەردێکی لای چەپی جادەکە یەکێ لەسوارانی زاپاتا دەستی نایە بناگوێی و سەری بەرزکردەوە وەکو چەقەڵ لوراندی. یەکێ لەدوو ئەفسەرەکە کە فەرماندەی دەستەکە بوون بەشڵەژانەوە سەرنجی دەوروبەری خۆی داو پرسیی

ـ ئەمە چ دەنگێ بوو؟

ئەفسەری دووەم بەخوێن سارییەوە وەڵامی دایەوە

ـ چەقەڵە...

ئەفسەری یەکەم قەناعەتی بەم وەڵامە نەبوو، دەستەی سەربازەکان هەر بەرەو پێش دەڕۆیشتن، لورەکە دووبارە بووەوە، هەر کە دەنگدانەوەی لورەکە ئەو ناوەی پێچایەوە لە نێوان لق و پۆپی دارەکانی هەردوو لای جادەکە، پیاوانی زاپاتا کە کراس و پانتۆڵی کەتانی سپیان لەبەردابوو، خۆیان هەڵدایە سەر سەربازەکان، پاش چەند دەقیقەیێك وەزع ئارامی تێکەوتەوە، زەردەخەنەی سەرکەوتن بەسەر لێوانی پیاوانی زاپاتاوە، لە نێوانی درەختەکانەوە دەرکەوتن هەندێکیان ئەسپی سەربازەکانیان بەدووی خۆدا ڕادەکێشا، هەندێکی دی پۆشاك و کەوشی دەست کەوتی پێ

بوو، هەندێکی دی چەکی سەربازەکانیان پێ بوو ئەمیلیانۆ زاپاتا لەسەر (پلانکۆ) چاوەرێی ئەمان بوو، ئۆفیمۆ، کەڕابەری ئەم هێرشەی کردبوو بەپێکەنینەوە بەرەو لای براکەی چوو و گووتی:

ـ سەیرکە بزانە چ ئەسپانی چاکم بۆ وەدەست هێناوی..

ئەمیلیانۆ گوتی:

ـ ئەی فیشەك؟ ئێمە پێویستمان بە تەقەمەنییە.

ئۆفیمۆ گوتی:

ـ ئەسپی چاکن.

ئەمیلیانۆ گوتی:

ـ ئەسپ، بەتەنها کەڵکی چیی هەیە، ئێمە چۆن دەتوانین بەبێ فیشەك و تەقەمەنی خەبات بکەین؟

پاشان جڵەوی (پلانکۆ)ی کێشا و هاواری کرد.

ـ ئێمە پێویستمان بەتەقەمەنییە.

لەو شوێنە دوور کەوتەوە.

## ١٠

ئەوان کەمێ دینامیتیان لەجبەخانەکەی دۆن ناسیۆدا دەسکەوتبوو، بەڵام بە دینامیت لەگەڵ سەربازەکانی پورفیریودیاز جەنگ دەکرا، شەوێ لە ئەشکەوتەکەدا دایان نابوو دەربارەی ئەم مەسەلەیە کەوتنە گفتوگۆ، هەندێکیان باوەڕیان وابوو تا درەنگ نەبووە خۆ تەسلیم کەن، بەڵام ئەمیلیانۆ گوتی پاش پساندنی سیمەکانی تەلەگرافەکە، ڕێی گەڕانەوە نیە. لە کۆتاییدا (سلدادرا) پێشنیازی کرد کە دینامیتەکان بخرێتە بەر دەستی ژنانەوە چونکە

چاکتر سودی لیٚ وەردەگرن.

هەتاو لە گۆشەی ئاسۆوە هەلاٚت، مەئموری شەستیر لەسەر بورجی حەرەسیاتی قەلاٚکە توشی دلٚە تەپیٚ ببوو، بەعەقلٚی کەسدا نەدەچوو زاپاتاو پیاوەکانی جورئەتی ئەوەیان هەبیٚ هیٚرش بهیٚننە سەر قەلاٚیێکی پڕچەکی سەختی وەك ئەم قەلاٚیە، بەلاٚم سەرەڕای هەموو شتێکیش کەسیٚ نەیدەتوانی لەدەس ئەم سوورپیٚستانە دلٚنیابیٚ. فەرماندەی قەلاٚکە پرسیاری لە حەرەسەکەی سەر بورجەکە کرد:

ـ چ هەوالٚیٚ نیە؟

سەربازەکە گوتی:

ـ تەنها چەند ژنێك.. هیچی دی دیارنیە.

بە پەنجە ئیشارەتی بۆ ناوەڕاستی مەیدانەکە کرد و بەردەوام بوو.

ـ خۆیان بۆ کڕینی پێداویستی ڕۆژانەیان ئامادە کردووە.

سەربازێکی دی سەری خۆی راتەکاند و گوتی:

ـ من لەم ژنە سوورپیٚستانە دلٚنیانیم..وەك لە پیاوانیان دلٚنیانیم..لە مانیش.. نزیکی دەرگای قەلاٚکە هەندیٚ ژن هاتوچۆیان دەکرد، (سلدادرا) بە لیٚهاتووییەوە فەرمانی بەسەریاندا دەدا

فەرماندەی قەلاٚکە هاواری کرد:

ـ ئا لیٚرەدا چ دەکەن؟

سلدادرا شتیکی چپانە گویٚی ژنان.. ژنان سەبەتەکانی خۆیان لە کەناری دەرگای قەلاٚدا لەسەر زەوی دانا، هەریەکە، بەئاسپایی دوورکەوتەوە، فەرمانەدەی قەلاٚکە هاواری کرد

ـ برۆ خواریٚ ئەو سەبەتانە بێنە.

بەرلەوەی سەربازەکە کە ئەم کارەی پیٚ سپیٚردرابوو بگاتە خوارێی قەلاٚ

پیرەژەنی رەنگ و روو گەشاوە مەشخەڵێکی بەدەستەوەبوو بەرەو قەڵاکە رایکرد کاتێك کە نزیکی دەرگاکە بووەوە، دەسرێژی شەستیر پەلە خوردی پێ کرد، پیرەژنەکە مەشخەڵەکەی دەستی دەگوشی و بەسکە خشێ خۆی گەیاندە دەرگاکە، لە سەر زەوییەکەدا هەندێ باروت دەبینرا کە دەگەیشتە سەبەتەکان، پیرەیژن مەشخەڵەکەی خستە سەر باروتەکە، دەستریژی دووەمی شەستیرەکە پیرەژنەکەی کون کون کرد. ئاگر لەباروتەکە بەربوو بەپەلە ئاگر بەرەو قەڵاکە دەچوو، پاش هەندێ دەنگی تەقینەوەیێکی گەورە دێی هێنایە لەرزین پاش تەقینەوەکە لەهەر ماڵێکەوە چەند چەکدارێ هاتنە دەرێ هەندێکیان پیادەو هەندێکیان سوار، هێرشیان بردە سەرقەڵاکە، لە کەلێنی دیوارە رووخاوەکە چونە نێو قەڵاکە. ئەمیلیانۆ بەسەر ئەسپەکەوە سەیری دەکردن، هێشتا نەببووە نیوەڕۆ تەقەمەنییەکی چاکیان دەست کەوت.

## ١١

بووە ئێوارە، بۆنی شومی مەرگ لە ئاسمانی ئەو شوێنەوە بەرزدەبووەوە هەندێ لە پیاوانی ئەمیلیانۆ خەوتبوون و هەندێکی دییان مژولی شیو خواردن بوون، ژنەکانیان چێشتیان لێ نابوو، چەند هەنگاوێ لەولاترەوە جەستەی پیاوانی زاپاتا و سەربازەکان کەوتبوونە سەریەك. ئەمیلیانۆ گەیشتە مەیدانی دێ، لە پشتی مێزێکەوە کەلەوەبەر تایبەت بوو بەفەرماندەی قەڵاکە دانیشت، خەڵکەکە بە سەرنجی خۆشەویستییەوە لە دەوریا کۆبونەوە. لە سەرمێزەکەدا دیارییەکانی خەڵکەکە دەبینرا دەستەگوڵ و مریشکی سورەوەکراو، تەنانەت بەرازێکی برژاو دەبینرا، پاپلۆ و ئۆفیمۆ لەنزیکی مێزەکەوە لەسەر زەوییەکەدا دانیشتبوون پێیان درێژ کردبوو، ئۆفیمۆ بتڵێکی نیوە خاڵیی، زوو زوو بەرەو لێوەکانی خۆی دەبرد،

پیرەژنێك چەپكە گوڵێكی بەدەستەوە بوو لە زاپاتا نزیك بووەوە و گوتی:

ـ ئارەزووم دەكرد لە ڕۆژێكی ئاوهادا بتبینم.

پاشان ڕێی بۆ پیاوێكی چڵكنی ڕیشدار كە پۆشاكی كەتانی جوتیارانی لەبەردابوو خۆش كرد، ئەم پیاوە بەپەلە بەرەو پێش دەهات و منداڵێكی شڵەژاوی بەدووی خۆیدا رادەكێشا، هەر كە گەیشتە مێزەكەی زاپاتا گوتی:

ـ ئەمیلیانۆ، ئەو شەستیرەكەی دوێنێ شەو لەسەر تەپۆلكەكەوە تەقەی لێدەكردن دێتەوە بیرت.

ـ بەڵێ لەبیرمە.

ـ ئەم منداڵە چكۆلەیە و براكەی لە نیوە شەودا خۆیان گەیاندە ئەوێ هەردووكیان بە ئازایەتییەكی لە رادەبەدەر توانیان دەست بەسەر شەستیرەكەدا بگرن ئەمیلیانۆ زەردەخەنەیەكی بۆ منداڵەكە كردو لێی پرسی.

ـ تۆ ئەم كارەت كرد؟

منداڵەكە بەدەنگی منداڵانەی خۆی وەڵامی دایەوە.

ـ بەڵێ جەنابی سەرۆك.

ـ ئەی كوا براكەت؟

ـ كوژرا.

ئەمیلیانۆ گوتی:

ـ دەبێ پاداشتت بدرێتێ، بڵێ بزانم چیت دەوێ؟ ئەو بەرازە برژاوە؟

حەز لەچاوانی منداڵەكەدا نەدەبینرا، بە ئەسپایی سەری وەرچەرخاند چاوانی لەسەر پلانكۆدا لەنگەری گرت.

ئەمیلیانۆ گوتی:

ـ بەڵام نەك ئەسپەكەی من.

منالەکە ماوەیێك دوو دڵ بوو، پاشان سەری راوەشاند

ئەمیلیانۆ گوتی:

ـ پلانکۆ ئەسپێکی چاکە بەڵام.. قەیدی نیە بابۆ تۆ بێ.

منالەکە سواری پلانکۆ بوو دەورەی پێ لێدا، زاپاتا بۆ چەند ساتێ بەرەو کەناری مەیدانەکە چو بەتەنهایی تێدەفکری، پاشان گەڕایەوە بۆ لای مێزەکە، لەم کاتەدا ئەسپیژۆ لە بەردەمیا سەوز بوو کە لەسەر یەك دەچەمییەوە و بەرزدەبووەوە و گوتی:

ـ دۆن ئەمیلیانۆ دۆستی ئازیزتر لەگیانی من! شانازی دەکەم نوێنەرانی ڕابەری گەورەمان فرانسیسکۆ ماردۆت پێ بناسێنم.

سێ ئەفسەر هاتنە پێشێ، فرناندۆ لەپشتی ئەوانەوە بوو. بە پێکەنینەوە تەوقەی لەگەڵ زاپاتا کرد، لە گیرفانی خۆی کاغەزی لۆك و مۆرکراوی دەرهێنا و لەسەر مێزەکەی دانا، ئەمیلیانۆ دەستی بەکردنەوەی کاغەزەکە کرد، بەڵام باوەڕی گۆڕی بانگی پاپلۆ و ئۆفیمۆی کرد لەنێو خەڵکەکەوە بەرەو پێش هاتن ئەمیلیانۆ گوتی:

ـ ئەمەم بۆ بخوێنەوە.

پاپلۆ بەدڵنیایەوە کاغەزی لۆك و مۆرکراوی کردوەوە بەم شێوەیە خوێندیەوە بۆ ئەمیلیانۆ زاپاتا..من فرانسیسکۆ ماردۆم، بەناوی رابەری هێزەکانی ئازادی خوازەوە ـ ئێوە بەفەرماندەی هێزەکانی جنوب دادەمەزرێنم ئومێدەوارم ئەو ڕۆژە زوو بگات تۆ بەسەرکەوتووانە ماچ کەم و پیرۆزباییتان لێ بکەم...بژیت مەکسیك.

پاپلۆ هەندێ وەستاو پاشان گوتی:

مادرۆ بەدەستی خۆی ئەم نامەیەی ئیمزاکردووە.

زاپاتا نامەکەی لە دەست وەرگرت، بە زەردەخەنەیێکەوە کەنیشانەی

ڕەزامەندی ناخی دەنواند، سەرنجی خەتەکانی نامەکەی دەدا، ئۆفیمۆ هەندێ مەست بوو هاواری کرد.

ـ ئێستا دەبێ تۆ پۆشاکی ژەنەراڵەکان بپۆشی و میدالەکانی ئەوان بخەیتە سەر سینگ.

پاشان دەستی بۆ گیرفانی برد وشتێکی دەرهێنا لە میدال دەچو لە سینەی ژەنەراڵ فۆنتسی کردبووەوە، دایە دەستی ئەمیلیانۆ و گوتی:

ـ ئەمە بخەرە سەر سینەت.

ـ ئەمەت لەکوێ هێنا؟

ئۆفیمۆ بەبێ ئەهمیەتەوە شانەکانی بەرز کردەوە و گوتی:

ـ لە سینەی ژەنەراڵێك..

## ١٢

کاتێ داخوازی هاتە پێشێ، خودی سینیور ئەسپیژۆ بۆ شایی ئەوان گەلێ بەپەلە تر بوو دەیگوت، لە هەموو خاکی مەکسیکدا جگە لە زاپاتا کەسێکی دی نیە شایستەی هاوسەری ژۆزفای کچی بێت، ئێوارەی ڕۆژێك، ژۆرفا و دایکی و پوری لە دەوری مێزێکدا دانیشتبوون گوێیان بۆ زاپاتا و باوکی ژۆزفا هەڵخستبوو، کە قسەکانیان بەدڵ با پێدەکەنین، بەدڵیشیان نەبا گرژدەبوونەوە کاتێ کە ئەم ڕوداوە سارد و وشکە کۆتایی پێ هات زەردەخەنەیێك لێوە جوانەکانی ژۆزفای لەیەك ترازاند.

سەعاتێ دەبوو ئەمیلیانۆ لەگەڵ ژنەکەیدا لە ژوورێ دانیشتبوو و چکلیتی گەرمی دەخوارد، لە دەرێدا دەنگی جۆراو جۆر دەبیسترا، پاش ماوەیێك، روخساری گەش و بەزەوقی پاپلۆ لەنێو چوارچێوەی

پەنجەرەکەدا دەرکەوت و گوتی:

ـ ئەمیلیانۆ.

هەندێ تورەبوون دەستی بەسەر زاپاتادا گرت و بەدەمارگیرییەوە گوتی:

ـ برۆ گومبە.

پاپلۆ سەری راوەشاند گوتی:

ـ هەواڵێکم پێیە دەبێ ئاگادارت کەمەوە (دیاز) مەکسیکی بەجێ هێشتووە.

ئەمیلیانۆ لەجێ هەڵساو بە ئاسپایی ژۆزفای لەباوەش گرت و گوتی:

ـ ئیدی جەنگ و خوێنرژتن تەواو بوو.

پاشان لێوە درشت و جوانەکانی ماچ کرد هەر لەهەمان کاتدا خەڵکی گوندەکە بۆ فیرارکردنی ژەنەراڵ پورفیریودیاز و ژن هێنانی ئەمیلیانۆ زاپاتا جەژن و شادییان دەگێڕا، لەپشتی پەنجەرەکەدا کۆببوونەوە بەدڵ و بەگیان خۆشحاڵیان دەنواند.

## ١٣

کاتێ کە ئەمیلیانۆ، چاوانی کردەوە، تازە گزنگ دادەباری و سپێدەی دابوو، دوو تاسێ سەعاتێ خەوتبوو، ژۆزفاش لەتەنیشتی و لەسەر قەرەوێڵەکە خەوتبوو و دەمی داچەقی بوو، زوڵفە ڕەشەکانی بەسەر روخساریا شۆڕ ببووەوە بەڵام هەموو ئەندامە وردەکانی روخساری نەپۆشی بوو.

ئەمیلیانۆ ئەو ڕۆژەی وەبیر هاتەوە، چۆن گوڵێکی زۆر کڵێسا چکۆلەکەی دێی رازاندوبووەوە، سەدان کەسی خەڵکی گوندەکە لە کڵێسادا کۆببوونەوە گوێیان لەقسەکانی (کەشیش) راگرتبوو، ئەو ڕۆژە پیرۆزباییان لێ دەکرد

و شەرابیان دەخواردەوە و سەمایان دەکرد گۆرانیان دەگوت. هەندێکیان تەوقەیان لەگەڵ دەکرد، هەندێکی دیش نوکتەیان دەگوت، زادەی بیر هاتنەوەی ئەم یادگارانە بزەیێکی کەم ڕەنگ لەسەر لێوە وشکەکانیا نەخشی بەست، بەڵام لە ناخیا هێشتا بە شێوەیەکی نادیار دەلەرزی، لە حەوشەی پاینی پەنجەرەکە هێشتا پاشماوەی چەژن و شادی مابووەوە، کەسێ گیتاری دەژەن، ژنێ بەدەنگێکی ناسك و خەماوی گۆرانی دەگوت.

ئەمیلیانۆ هەڵسا، بەئاسپایی نزیکی پەنجەرەکە بووەوە، سەیرێکی خوارەوەی کرد..

لە پەنای دیوارەکەدا، نزیکەی دوانزە کەس لەسەر زەویدا دانیشتبوون بتلێکی شەرابی گەورە ئەم دەست و ئەو دەستی دەکرد، کاتێ ئەمیلیانۆ سەیری کرد، ئۆفیمۆی برای و پاپلۆ و فرناندۆش لەوێدان بزەیێکی هاتێ. لەم کاتەدا ئۆفیمۆ بەلای راست دا چەمییەوەو روخساری فرناندۆی ماچ کردو پێی گوت:

ـ من تۆم خۆشدەوێ فرناندۆ.. بەڵام حەزم لەسەروسەکوتت نییە هەرگیز حەزم لەسەروسەکوتت نەبووە.

فرناندۆ وەکو ئەوانی دی مەست نەبوو، بەتاڵی و بێزارییەوە گوتی:

ـ هەموو شادن و جەژنیان بەرپاکردووە، کەچی هێشتا سەرکەوتنی یەکجارەکیمان بەنسیب نەبووە، دەبا تێکۆشان خوێنی لەمە زیاتری ڕژتا.

ئۆفیمۆ هەندێ خۆی دوور خستەوە و گوتی:

ـ چاکە، گەلێ چاکە، نۆرەی کوشتن و خوێن رشتنیش دێت، بەڵام ئێستا دەربارەی ئەو شتانە قسان مەکە. وەرە با شادبین و خۆ مەست بکەین، پاشان بتڵە شەرابەکەی بۆ درێژ کرد، فرناندۆ قومێکی خواردەوەو گەڕانیەوە بۆ ئۆفیمۆ. ئەمیش نەیکردە نامەردی و دوا تکی داچۆڕاندە گەروی خۆی.

ئـەمیلـیـانـۆ بـەتـەنیشتـی قـەرەوێڵـە کـۆنـە بـرۆنـزییـەکەدا تێپەڕی، ژۆزفـا لەخەو هەڵسابوو و سەیری دەکرد، ئەمیلیانۆ دەستە ناسکەکانی ژۆزفای لەدەست گرت و نەوازشی دەدا، ژۆزفا سەرنجێکی قوڵی تێگرت و گوتی:

ـ گەلێ نارەحەت دیاری، مەگەر تۆ خۆشبەخت نیت؟

ئەمیلیانۆ سەری راوەشاندو گوتی:

ـ بنوو...

ژۆزفا دووبارە پرسییەوە

ـ لە چ شتێ نارەحەتی؟ پارچە زەوییێکی موناسیب، خانوویێکی چکۆلە بۆ خۆمان دروست دەکەین تۆیش خەریکی ڕواندنی شوتیە و ئەسپ رامکە و سەرپەرشتی منداڵەکانمان دەکەین.

ئەمیلیانۆ گوتی:

ـ دوو دەست جل و بەرگی جوانیشت بۆ دەکڕم.

چـەمییـەوە و لـێوانـی هـاوسەرەکـەی مـاچ کـرد، بـەڵام هـێشتـا نیشانـەی نارەحەتی بەروخسارییەوە دیاربوو. ژۆزفا گوتی:

ـ ئەمیلیانۆ جەنگ و خوێنرێژی تەواو بوو وانیە؟

ـ بەڵێ تەواو بوو، مادرۆ لە پایتەختە، سبەی بۆ دیدەنی ئەو دەچم.

ـ منیش لەگەڵ خۆتا دەبەی؟

ـ ئەم جارەیان نەء.

ژۆزفا بەبێ هیچ پێشەکییێك گوتی:

ـ پێت وایە ئێمە منداڵمان ببێت؟

ـ ئەڵبەتە.

ـ کەوابێ ناوی هەر هەموویان دەنێم فرانسیسکۆ، چونکە فرانسیسکۆ

مادرۆ ئاشتی و ئارامی هێنایە وڵاتی ئێمە.

ئەمیلیانۆ ئەم قسەیەی نەبیست، لەسەر قەرەوێڵەکەدا دانیشت ژۆزفا بەدەنگێکی ناسکەوە پرسیی.

ـ ئەڵێی لەمن نارەحەتی؟

ـ نەء ژۆزفا، پەیوەندی بەتۆوە نیە.

ـ ئەی چییە؟

ـ من سبەی بۆ دیدەنی مادرۆ و هاورێکانی دەچم. هاورێکانی مادرۆ هەمو خوێنەوار و شارەزان، لەوێدا ئەسپ و تفەنگەکەی من کەڵکی هیچ شتێکی نیە نوسین و خوێندن نازانم و هیچیش فێرنەبووم.

عارەقی شەرم نیشتبووە سەر توێڵی و هەندێکیش دەنگی دەلەرزی ژۆزفا هەناسەیێکی هەڵکێشاو دەستی مێردەکەی ماچ کرد و گوتی:

ـ ئەمەیە تۆی نارەحەت کردووە؟

ـ تۆ خوێندن و نوسینم فێردەکەی؟

ـ ئەڵبەتە.

ئەمیلیانۆ هەڵساو لەسەر تاقێکدا کتێبێکی ئینجیلی هێناو گوتی:

ـ ئێستا فیرم کە.

## ١٤

کاتێ ئەمیلیانۆ زاپاتا چووەلای فرانسیسکۆ مادرۆ کە مەکسیکی ئازاد کردووە و سەرۆك کۆمارە، گەلێ خۆشی بەچارەیا هات، نگای چاوە قاوەیەکانی گەلێ گەرم و میهرەبان بوو، دەمی هەمیشە زەردەخەنەی لەسەربوو، بەڵام روخساری.. روخساری پیاوێکی رابەر و بەئیرادە نەبوو، لاوازی و سستی ئیرادە لە روخساری دا

دەباری، تەنانەت ریشە کورتەکەی نەیدەتوانی ئەوسستیە بپۆشێ، ئەمیلیانۆ تەوقەی لەگەڵدا کرد، هەرلەیەکەم ساتدا درکی بەوە کرد، ئەم دەستانە دەستی کەسێ نیە کاری قورس و زەحمەتی پێ ئەنجام دابێ و پەنجەکانیشی ئاشنای پەلەپیتکەی تفەنگ نین. لەسەر زەورییەکەدا نەخشەیێکی گەورەی مەکسیك پان کرابووەوە، فرانسیسکۆ مادرۆ بۆ زاپاتای شەرح دەکرد کە جەنگ دژ بەدیاز چۆن سەرکەوت. ئەمیلیانۆ بە سەبرەوە گوێی بۆ قسەکانی سەرۆك کۆمار هەڵخستبوو لە کۆتایی قسەکاندا ئەم پرسیارەی کرد، چ کاتێ زەوی جوتیارەکان دەدرێنەوە؟

سەرۆك کۆماری نوێی مەکسیك گوتی:

ـ ئەم کارە وەقتی پێویستی پێ دەوێ، دەبێ لە هەموو لایەنەکانی وردبینەوە لێگەرە تا شتێکت نیشان دەدەم.

دەستی بۆ هەندێ نەخشە درێژ کرد. کە لەسەرمێزەکەیدا بلاوببونەوە، نەخشەیێکی چکۆلەی دەرهێناو گوتی:

ـ سەیری ئێرە بکە ئالێرەدا دوو رووبار یەك دەگرنەوە، زەوییەکی بەپیتی لێیە، تەنانەت پێیان گوتووم، تەلارێکی گەورەو جوانیشی تیا دروستکراوە، ئایا دەزانی ئەمە چییە ژەنەراڵ زاپاتا؟

زاپاتا سەری راوەشاند، مادرۆ بەردەوام بوو

ـ ئەمە کێڵگەی تۆیە، هەر لەرۆژگارانی کۆنەوە، رەسم وابووە، پاداشت بردێتە ژەنەراڵە سەرکەوتووەکان. منیش ئەم کێڵگەیەت پێ دەبەخشم، تورەبوونێکی کوت و پڕ سەراپای ئەمیلیانۆی گرتەوە، نەیتوانی دەستی بەسەرابگرێ، لە کاتێکدا بەتوندی قۆناغی تفەنگەکەی دەکێشایە سەرزەوی ژورەکە، گوتی:

ـ من بۆ ئەمە نەجەنگاوم کە کێڵگەیێك تەنها بۆ شەخسی خۆم وەدەست

بێنم، ئەو زەوییانەی هی من و هی هەموو خەڵکانی دی بووە، چی لێ دێ؟

بەبێ پێشەکی نیشانەی ماندوبوون کەوتە سەر روخساری مادرۆ، گوتی:

ـ ژەنەراڵ زاپاتا تکا دەکەم دانیشە

ـ نامەوێ دانیشم، دەمویست بزانم مەسەلەی زەوییەکان بەرەو کوێ دەچێت؟

ـ یەکەکاری منیش مەسەلەی زەوییە، بەڵام بەر لەوەی دەست بەم کارە بکەین دەبێ خەڵکەکە چەك کرێن، لەحەقیقەتیشدا یەکەم تکای من لەئێوە ئەوەیە کە ئێوە و پیاوەکانتان چەکەکانتان دانێن و رێکخستنەکانتان هەڵوەشێننەوە.

ئەمیلیانۆ بەسەرسورمانەوە سەیری سەرۆك کۆماری دەکرد، توڕەبوون و دەمارگیری لە روخساریا رەوینەوە بەڵام هێشتا دوو دڵ بوو، مادرۆ گوتی:

ـ ژەنەراڵ سەیرکە.. ئایا تۆ باوەرت بەمن هەیە؟

ئەمیلیانۆ دەستی دایە تفەنگەکەی و گوتی:

ـ بەقەد ئەوەیە کە خەڵك باوەری بەمن هەیە.. یانی تا ئەوکاتەی پەیمانەکان نەشکێ.. تەنانەت بۆ یەك دەقیقە زوتریش..

پاشان وەرچەخاو بەرەو دەرگا چوو، بەڵام بەرلەوەی بچێتە دەرێ گوتی:

ـ من دەگەرێمەوە بۆ ماڵ و چاوەرێ دەکەم، تا بزانم دەربارەی زەوی، چ دەکەن بەڵام ئەوەیش بزانن کە زۆر چاوەرێ ناکەم.

چەند ساتێ پاش رۆیشتنی ئەو ژەنەراڵ (هۆرتا) لەگەڵ ئاجودانەکەی[1] بەهەناسە برکێوە هاتە ژوورەکەی مادرۆ. ژەنەراڵ هۆرتا پیاوێکی گەلێ جدی بوو لە روخسارییەوە دیاربوو، بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی

---

(١) ئاجودان: وشەیێکی فەرەنسیە بەمانای «مورافق» دێت.

هـەمـوو كـارێ دەكـات هـەر كـە گـەیشتـە مێزەكـەی مـادرۆ دەنگـی بـەرز كردەوەو گوتی:

ـ دەبێ بریار بدەی هەر ئێستا ئەم زاپاتایە ئیعدام بكەن.

سێبەری بەدگومانی كەوتە سەرو روخساری مادرۆ و پرسیی

ـ ژەنەراڵ بۆ تۆ گوێت گرتبوو.

هورتا گوتی:

ـ من ئاگادارت دەكەمەوە، كات لەدەست مەدە، زاپاتا ئیعدام كە.

مادرۆ گوتی:

ـ من میللیەتی خۆم ئیعدام ناكەم، من متمانەی پێ دەكەم.

ـ كەیفی خۆتە، بەردەوامی بدە بەمتمانەت، بەڵام لەگەڵ پیاوانی خۆمدا بەرەو مورەلوس دەچم، ئەو و پیاوەكانی چەك دەكەم.

مـادرۆ سەری راوەشانـد، ئـەمـجـارەیـان لـە مـاسولـكـەكـانـی روخساریـا سەختی ئیرادەی بەتین دەردەكەوت، ئەمیلیانۆ ئەمەی نەبینیبوو، گوتی:

ـ نەء.. من ئەمەت لێ قەدەغە دەكەم، دەبێ لە ئەنجامدانی ئەم جۆرە كارانە خودداری بكەی، من خۆم بەبێ هێزی سەربازی دەچمە مورەلوس قەناعەت بەزاپاتا دێنم چەك دابنێن.

پاشان سەری بە نیشانەی خواحافیزی، هەندێ دانەواند، لەژورەكەی چووە دەرێ، كاتێ دەرگای سەرۆك كۆماری مەكسیك بەسترا، ژەنەراڵ هۆرتا بەپەلە ڕووەو پەنجەرەكە چوو، لەگەڵ هەناسە هەڵكێشانێكی قوڵدا بەئاجودانەكەی گوت:

ـ بۆنی سادەیی و خۆش باوەڕی خەریكە دەمخنكێنێ، هەندێ شەرابم دەیێ تا هێز بەدڵم ببەخشێ.

ئـاجـودان، بـتـڵـێ شەرابـی دایـە دەستـی، هـورتـا بـیـنـێكـی درێژی پێوەنـا

بەبێزاریەوە گوتی:

ـ تا زاپاتا زیندووبێ، بەهیچ ناگەین، چونکە ئەم پیاوە بەراستی باوەڕی بەو ئامانجانەیە کە لە پێناویا جەنگی کردووە.

ئاجودان بەڕەزامەندییەوە سەری راتەکاند و گوتی:

ـ فرانسیسکۆ مادرۆیش هەروایە

هۆرتا قومێکی دیی لەشەرابەکەداو گوتی:

ـ مادرۆ وەکو مشك وایە، لول کردنی ئاسانە، بەڵام زاپاتا لەحەقیقەتدا پڵنگە و ترسێنەرە.. پڵنگیش دەبێ بکوژێت!

پاشان چەند هەنگاوێکی کورتی هەڵهێنا، چەکمەکانی قوڕاوی بوون لەسەر نەخشەکەی مەکسیکدا کە هێشتا لە ناوەندی ژوورەکە بە پانکراوی مابووەوە وەستا. لەم کاتە بزەیێکی مانادار لێوانی لە یەك ترازاند.

## ١٥

جوتیارانی گوندی مورەلوس لە مەیدانی دێدا گوێیان بۆ قسە لەسەرخۆکانی سەرۆك کۆماری مەکسیك هەڵخستبوو، بەڵام هەر هەموویان سەرنجیان بڕیبووە زاپاتا، کاتێ کە قسەکانی فرانسیسکۆ مادرۆ تەواو بوو هەموویان تەنانەت خودی مادرۆش چاوەڕوان بوون لەم کاتەدا ئەمیلیانۆ زاپاتا بەسەر راتەکاندن قایل بوونی خۆی دەربارەی چەك دانان، خستەڕوو، خەڵکەکە بەرەو ماڵەکانیان کەوتنە ڕێ و تفەنگەکانیان هێناو تەسلیم بە مەیمورانی دەولەتیان کرد، هەموو شتێ کۆتایی پێهات، هەندێکیان خۆشحاڵ بوون چونکە بەبێ تفەنگ خوێن ڕشتن نەدەما، هەندێکیشیان نارەحەت بوون یەکێ لەو نارەحەت بووانە خودی ئەمیلیانۆ زاپاتا بوو.

لـە مـەیدانـی دێدا، زاپـاتـا لـە نزیکـی مـێزێکدا وەستـابـوو، مـاندوو بـوون لـەروخساری ئـەو دادەبـاری، لـەژێر چـاوەکـانـییـەوە بـازنـەیێکـی شین بـاو دەبـیـنـرا، سمـێڵـەکـانـی ڕێك نـەخستـبـوو، پـرچـی شانـە نـەکـردبـوو، بـە زەردەخەنەو ماندووبونەوە بەفرانسیسکۆ مادرۆی گوت:

ـ من سەر لەم ئاشتییە دەرناکەم، پێم وایە خەبات و جەنگی زیاد ئێمەی خەڵەفاندیٚ.

پاشان لەنێوان خەڵکەکە پەنجەی بۆ پیرەمێردیٚ درێژکردو بەردەوام بوو:

ـ سەیری ئەمە بکەن.. ئەمە ئەپۆلۆنیویە لە قەڵافەتیا هیچ شتیٚ بەدی ناکریٚ، بەڵام چاکترین جەنگاوەرە کە تا ئێستا هەمانە.. ئەپۆلۆنیو وانیە؟ پیرەمێرد گوتی؟

ـ نەء.. گەلیٚ لە من باشتر هەبوون.. بەڵام زۆربەیان کوژران.

فرمێسك لەچاوانی پیرەمێردا کۆبوونەوە.. ئەمیلیانۆ بەپەلە، رووی لە مادرۆ کرد و گوتی:

ـ دەربارەی ئەو منداڵە، کە ئەسپەکەی منی بەدیاری وەرگرت هیچم بۆ باسکردوی؟

ـ بەڵیٚ ئێستا لە کوێیە؟ گەلیٚ حەز دەکەم بیبینم.

ئەمیلیانۆ بەحەسرەتەوە گوتی:

ـ ئەو مردووە. هەر چەندەمان کرد نەمانتوانی (پلانکۆ) بدۆزینەوە لەم کاتەدا پیرێژنێکی کۆما و نزیکی مێزەکە بووەوە و سیٚ تفەنگی لەسەر دانا، ئەمیلیانۆ گوتی:

ـ ئەم ژنە مێردەکەی و دوو کوڕی لە جەنگدا لە دەست داوە.

مـادرۆ چـەنـد هـەنـگـاویٚ رووەو پـیـرێژنـەکـە چـوو، دەستـی خستـە

گیرفانەکانی خۆی، تا هەندێ پارەی بداتێ، جگەلە سەعاتە زێڕەکەی خۆی چیدی نەدۆزییەوە پیرێژنەکە پێی گوت:

ـ نا..نەء ئەمە گەلێ بەقیمەتە

فرانسیسکۆ مادرۆ سەعاتەکەی نایە نێو دەستی و پێی گوت:

ـ بەڵام نەك بە ئەندازەی مێردو کوڕەکانت.. کە لە دەستت داون

کاتێ کە ئۆفیمۆ هاتە مەیدانەکەوە، سەیری کرد گالیسکەی، یەکێ لە دێهاتیەکان پڕ کراوە لە تفەنگ، خەڵکی بێ دیفاعیش بەرەو ماڵەکانیان گەڕاونەتەوە، لە بینینی ئەم دیمەنە نەڕاندی:

ـ هێزەکانی ژەنەراڵ هۆرتا لە دەربەندەکەوە پەڕینەوە.

ـ قەد ناشێ، من ئەم ڕێیەم لێ گرتووەوە.

ئۆفیمۆ ئیشارەتی بۆ سێ کەس کرد کە لە کەناری جادەکە، ئاویان لە گۆزەیەك دەخواردەوە و گوتی:

ـ پێش قەرەوڵەکان ئەوانیان بینیوە.. پاپلۆ ئەم حەرەسانەی لە دەربەندەکەدا دانابوو.

پاشان بە نارەحەتی و پەشێوی رووی وەرچەرخاند نەوەك چاوی بەچاوی مادرۆ بکەوێ؟

مادرۆ گوتی:

چەند کەسن؟

ئۆفیمۆ وەڵامی دایەوە.

ـ سێ بەتالێونن بەهەموو تەقەمەنی و تۆپخانەیانەوە

مادرۆ خۆی قیت کردەوە گوتی:

ـ من بۆ پێشگیری ئەم کارە دەچم، ژەنەراڵ هۆرتا ئەو جورئەتەی نیە لەئاستی مندا سەرپێچی بکات.

کاتیٚ مادرۆ و ئەمیلیانۆ، بە تەنیشتی یەکدیدا دەرۆیشتن جەماوەری گوندەکە دابارین و تفەنگەکانی خۆیان دووبارە هەڵگرتەوە و کەوتنە دووی ئەوان.

## ١٦

شەڕێکی سەخت و خوێناوی بەرپابوو، بەڵام زۆری نەکێشا، هەر کە هێزەکانی ژەنەراڵ هۆرتا گەیشتە نێو بێشەکە، لە هەموو گۆشە و کەنارێکەوە ژن و پیاوی چەکدار دابارینە سەریان، گەرچی جەنگەکە زۆر درێژەی نەکێشا، بەڵام کەسانێکی زۆر کوژران، ئەو پیرێژنەی کە سەعاتە زێڕەکەی لە مادرۆ بەدیاری وەرگرتبوو، لەنێو کوژراوەکاندا بوو هێشتا سەعاتەکە لە نێو دەستیا دەدرەوشایەوە. هێزەکەی ژەنەراڵ هۆرتا پاشەکشێی کرد، بەڵام شکستی نەهێنابوو، چونکە کاتیٚ فرانسیسکۆ مادرۆ گەیشتە مەکسیسکۆ، ژەنەراڵ هورتا ئەوی دەستگیر کرد و لە تەلارەکەی خۆیدا حەپسی کرد. ئیدی سەرۆك کۆمار کەسێکی نەما، تا بەهانایەوە بیٚ، جگە لە ئاجودانەکەی کە نێوی فیکتۆریانۆ بوو، پیاوێکی ئارام و لەسەرخۆ بوو، مادرۆ ئاجودانەکەی خۆی ناردە لای ژەنەراڵ هۆرتا، تا هۆی ئەم بەندییەی خۆی بزانی. بەڵام کاتیٚ کە فکتوریانۆ گەڕایەوە ـ روخساری شێواو دەستەکانی دەلەرزین.

فکتوریانۆ گوتی:

ـ جەنابی سەرۆك کۆمار تۆ زیندانی نیت.

ئەو ئەفسەرێکی گەنج بوو، قۆزییە لەڕادە بەدەرەکەی کردبوویە خۆشەویستی ژنان، تەنانەت هەندیٚ ژن پێیان وتبو زەردەخەنەکانی

نەخشێکی جوانتر دەخاتە سەر روخساری.

فکتوریانۆ، بەردەوام بوو

ـ ئێوە لەبەر ئەوە لێرەدا دوژمنتان زۆرە ئاگادارت دەبن تالەشەڕی دوژمنەکانت بتپارێزن، ئێوە لە دەرێی تەلاردا دوژمنی زۆرتان هەیە.

نیشانەی سەرسورمان بەروخساری مادرۆدا دەرکەوت و گوتی:

ـ کام دوژمنان؟

ـ ئەمیلیانۆ زاپاتا و پانچۆفێلا، ئەم دووە دژ بەئێوە یاخی بوون

نیشانەی هاودەردی بەروخساری فکتوریانۆ دەرکەوت و گوتی:

ـ بەڵام ترسی پێ ناوێ، ژەنەراڵ هۆرتا دەڵێ پشت گیری لە ئێوە دەکات دەستوری بەمن داوە ئەمشەو بۆ گفتوگۆ کردن ئێوە ببەمەلای ئەو

مادرۆ گوتی:

ـ سوپاست دەکەم فکتوریانۆ، دەمزانی کە دەتوانم متمانەت پێ بکەم. من هەمیشە متمانەم پێ دەکردی.

## ١٧

کاتێ کە فرانسیسکۆ مادرۆی بردە نێو باغی تەلاری کۆماری تا ئیعدامی بکەن، فیکتوریانۆ چیدی پێنەکەنی، هەر کە دەنگی دەستریژی گوللە، بێدەنگی شەوی شەقار کرد، رەنگ لەروی فیکتوریانۆ پەڕی، چونکە خۆی بە بەرپرسیاری مەرگی ئەو کەسە دەزانی کە مەکسیکی رزگار کردووە. پاشان ئیجازەی لە ژەنەراڵ هۆرتا وەرگرت و پێ گوتبوو وەزعی باش نیە.

کاتێ کە فیکتوریانۆ، دەیویست بڕوات، ژەنەراڵ هۆرتا بەپێکەنینەوە پێی گوت شەو باش ئەفسەری لێهاتوو

پاشان گەڕایەوە بۆ لای ئاجودانەکەی خۆی و گوتی:

ـ ئێستا لە شەڕی مشك رزگاربووین

ئاجودان سیگارێکی دایێ ژەنەراڵ لێی پرسی؟

ـ شەرابت پێیە.

ئاجودان بتڵێ شەرابی دەرهێنا. ژەنەراڵ هۆرتا بینێکی قوڵی پێوەنا، کە بە پشتی دەست لێوەکانی خۆی سڕییەوە گوتی:

ـ مشك ئیعدام کرا.. بەڵام خستنە نێوداو و کوشتنی پڵنگ گەلێ سەختترە..

## ١٨

جەنگاوەران جارجار سەردەکەوتن لە هەندێ شوێندا شکستیان دەهێنا بەڵام تێکۆشانی خوێناوی هەربەردەوام بوو، لە پێدەشت و هەردا دەجەنگین، گەلێ جار کاتی ئەوەیان نەدەبوو جەستەی مردوەکانی خۆیان بشارنەوە.

وای لێهات هێزەکانی ژەنەراڵ هۆرتا پاشەکشێی کرد، بۆنی سەرکەوتن گەیشتبووە لوتی جەنگاوەران ئەمیلیانۆ پێیانی دەگوت، تێکۆشان گەیشتووەتە دوا قۆناغەکانی خۆی، پاش ماوەیێکی کەم سەرکەوتنی یەکجارەکی وەدەست دێنین.

بایێکی سادر لەنێوان لق و پۆپی درەختەکانی حەوشە گەورەکەوە دەهات بۆنی نزیك بوونەوەی وەرزی خەزانی پەرشو بڵاودەکردەوە، ئێوارێ کاتێ هەتاوی سور لە نێو ئاسۆی زێریندا لە نێو هەورە تەڵخەکاندا پەنهان دەبوو، ئەمیلیانۆ و فرناندۆ هاتنە حەوشەکە، بای سارد گەڵا وەریوە وشکەکان و پارچە کاغەزی بەرەو ئاسمان دەبرد لەنێو هاژەی

بایەکەدا دەنگی گریانی ژنێك لەدوورە دەبیستراو دەبووە سەرباسی ئەم دوو کەسە، جارجاریش لە دوورەوە دەنگی دەستریژی گوللە دەبیسترا.. لەو شەوە نیوە ڕۆشنەی پایزدا، بەجوانی دەبینرا، ئەو شور و گەشییەی جارانی چاوانی ئەمیلیانۆ دیارنین، روخسارو جەستەیشی لاواز تر دەبوون، بەڵام زبـر و بـێ رەحـمـی لـە روخساری فـرنـانـدۆ دادەبـاریـن، سەخت تـرو توندتربوون چاوا نیشی تورەیی و غەزەبی دەنواند. لەم کاتەدا ڕووی لە ئەمیلیانۆ کردو گوتی:

ـ ئایا بەئەندازەی پیویست ئامادەی بۆ وەجێ هێنانی ئەو کارە کە پێویستە بیکەین.

ئەمیلیانۆ وەڵامی نەدایەوە، بەیەکەوە بەحەوشەکەدا تێپەرین بەرلەوەی بگەنە ژوورێکی چکۆلە، سەیری کرد، سلدادرای ژنی پاپلۆ، لە کەناری دیواری تەنیشتی کووانوەکەدا دانیشتووە خەریکی چێشت لێنانی گۆشتی کـیسەڵـە زەردەخـەنـەیێك لێوانی زاپـاتـای لـەیـەك ترازاند، بـەڵام سلدادرا، ئەگەر چی دەنگی پێی ئەوی بیستبوو، سەری بەرزنەکردەوەو هەر خەریکی کارەکەی خۆی بوو، فرناندۆ بەر لە ئەمیلیانۆ چووە ژورە چکۆلەکە، لەسەر مێزێکدا مۆمێ دەسوتا لەبەر رۆشنایيە کزەکەیدا چرچ و لۆچی روخساری پاپلۆ دەبینرا کە لە نێوان دوو حەرەسدا دانیشتبوو هەرکە ئەمان چوونە ژوورێ پاپلۆ زەردەی هاتێ، بەڵام ئەمیلیانۆ رووی نەدایێ لە گۆشەیێکی ژوورەکـە، تـا ئـەو شوێنـەی دەیـتـوانـی دوورتـریـن جـێی هـەڵبـژارد لـەسەر کورسییەکی شکاودا دانیشت، فرناندۆ لەبەر دەرگاکەدا وەستا، بەسەرنجی تۆمەت ئامێز تەماشای پاپلۆی دەکرد. کەبینی چ کەسێ قسان ناکات ئەمیلیانۆ، سەری بەرزکردەوەو گوتی:

ـ پاپلۆ پەیوەندی بەدوژمنەوە کردووە، بۆ سەلماندنی ئەم مەوزوعە بەڵگەم بەدەستەوەیە.

پاپلۆ بەدەنگێکی خەم ئامێزەوە گوتی:

ئەمیلیانۆ تۆ پێوستت بە بەڵگە نیە، تۆ تەنها پرسیار لەمن بکە ئەم مەوزوعە راستە، بەر لە ئیعدام کردنی فرانسیسکۆ مادرۆ من پەیوەندیم پێوە کردووە ئەو دەیویست خانوو بۆ مەردم دروست کات و زوەویشیان بداتێ، ئەو پیاوێکی چاك بوو لە دوورەوە دەنگی چەند تەقەیەك دەبیسترا.

پاپلۆ هەندێ بێدەنگ بوو پاشان گوتی:

ـ مەبەست و ئامانجی سەرەکی ئێمە لەم تێکۆشانەدا وەدەست هێنانی ئەوە بوو ئێمە دەمانویست بۆ پەیدا کردنی خۆراك زەوی و کشتوکاڵ وەدەست بێنین، گەنمە شامی تیا بروێنین، ئازادیشمان دەویست بەڵام نەك تەنها هەر ناوەکەی بەڵکو بەشێوەییێك دەمانویست کە مەکسیکییێك بتوانێ، پاش کاری رۆژانەی خۆی ئێوارێ لەماڵەکەی خۆیدا دانیشێ و بەسەربەستی بیر بکاتەوە بیروڕای لەگەڵ هاوسێکانیدا بگۆڕێتەوە، ئاشتیمان دەویست بەڵام نەك بەشێوەی خەونێکی وەدەست نەهاتوو. بەڵکو بەشێوەی ئارامی و خۆشەویستی هاوکاری یەکدی دەمانویست. ئەمیلیانۆ من هەمیشە لەخۆم پرسیوە، ئایا لەکارێکی ئاوها ئەنجامێکی چاك وەدەست دێت؟ ئایا لەنێو ئەم هەموو کوشت و کوشتارە ئاشتی پایەدارەبێ؟ ئایا پاش ئەم هەموو دڕندەیی و دەربەدەرییە، ئاسایش بەرقەراردەکەین؟ ئەمیلیانۆ، من هێشتا وەڵامی ئەم پرسیارانەم پەیدا نەکردووە ئەمیلیانۆ ئەی. ئایە تۆ وەڵامی ئەمانە دەزانی؟

دەنگی چەند تەقەیێك لەدەرێدا دەبیسترا، فرناندۆ گوتی:

ـ خائینان، دەبێ بکوژرێن، ئەمە قانونی ئەبەدی بەشەرییەتە نابێ چاوپۆشی لەهیچ کەسێ بکرێ

ئەمیلیانۆ سەری بەرزکردەوەو گوتی:

ـ پاپلۆ، ئایە قانونی سزای هاوکاری لەگەڵ دوژمندا دەزانی؟

ـ بەڵێ ژەنەراڵ.

ـ لەگەڵ ئەمەشدا بێ دەربەست بووی و پشت گوێت خستووە؟

ـ بەڵێ ژەنەراڵ

سزای خۆت دەزانی؟

رەنگ لە رووی پاپلۆ پەڕی و گوتی:

ـ بەڵێ ژەنەراڵ

فرناندۆ گوتی:

مەئمورەکانی ئیعدام کردن بانگ بکەم

پاپلۆ بەپارانەوە گوتی:

ـ ئەمیلیانۆ، بێگانەکان گاز مەکە، ئێمە لە منالّی لەوسەردەمەی بەدووی پەلەوەرەکان و لە نێو گێڵگەی گەنمەشامیدا لە پاڵ یەکدیدا ڕاماندەکرد لەو دەمەوە دۆست و هاورێین. تۆ خۆت ئەم کارە ئەنجام بدە تکا دەکەم.

ئەمیلیانۆ بەئیشارەتی سەر، فرناندۆ و هەردوو حەرەسەکەی تێگەیاند کە لە ژوورەکە بچنە دەرێ. هەر ئەو دووانە لە ژوورە نیوە تاریکەکە بەیەکەوە مانەوە ئەمیلیانۆ لە جێیەکەی خۆی هەڵسا دەمانچەکەی خۆی لەکیف هێنایەدەر فرناندۆ لە ناوەراستی حەوشەکەدا چاوەرێی ئەنجام دانی کارەکەبوو، لە پڕ سوارێکی تەپوتۆزاوی بەچوارناڵە گەیشتە حەوشەکە، هەر کە دابەزی پرسیاری لە فرناندۆ کرد

ـ ژەنەراڵ زاپاتا لە کوێیە؟

من پەیامێکی بە پەلە و گرنگم لە لایەن ژەنەراڵ پانچومێلاوە هێناوە.

فرناندۆ دەستی راستی بەنیشانەی بێدەنگ کردنی بەرزکردەوە و پێی گوت:

ـ ئێستا ژەنەراڵ زاپاتا کاری هەیە

لەم کاتەدا لە نێو ژورەکەوە دەنگی تەقە گەیشتە گوێ، سەرسوڕمان ڕوخساری قاسیدی داگرت (سلدادرا) لە جێیەکەی خۆیەوە بەرزبووەوە، بۆ چەند ساتێ پاڵی دایە دیوارەکەوە و سەیری دەرگای ژورەکەی کرد و پاشان لە نێو تاریکی شەودا ون بوو فرناندۆ دەرگای ژوورەکەی پێشانی قاسیدەکە دا و گوتی:

ـ ئێستا ژەنەراڵ زاپاتا پێشوازیت دەکات.

بارەگای زاپاتا، خانویەکی بچوك بوو کە تەنها یەك ژووری تێدابوو، مێزێك و دوو کورسی کون و میحرابێکی چکۆلەی تیادا دەبینرا، دیوارەکانی ژوورەکە لە تەختە دروست کرابوون، تەنها یەك پەنجەرەش لە ژوورەکەدا هەبوو لە نێوان چوار چێوەی پەنجەرەکەوە رۆشنایی بەئەندازەی پێویست نەدەهاتە ژوورەوە. مۆمێکی کز لە ژێر وێنەی حەزرەتی مەریەم دانرابوو، سەر قەرەوێڵەکەی رۆشن کردبووەوە.

ئەمیلیانۆ خەوتبوو پرخەی دەکرد، ژۆزفا بێدار بوو، شانی دادابووەوە سەیری مێردەکەی دەکرد و پێدەکەنی لە مێژبوو مێردەکەی لە نزیکی خۆیەوە نەبینیبوو، ئەوا ئێستا جارێکی دی هاونوێنن، لە خۆشیا خەریك بوو پەلوپۆ دەرکات.. لە دوایدا خەو زۆری بۆ هێنا و لە تەنیشتی مێردەکەیا راکشا.

پاش چەند دەقیقەیێك دەرگای ژوورەکە کرایەوە، لە نێوان چوارچێوەی دەرگاکەوە روخساری خەم ئامێزی (سلدادرا) دەرکەوت. کاتێ کەچەمییەوە پشتە رووتەکەی ئەمیلیانۆی کردە نیشان، نوکی چەقۆکەی دەستی بریسکایەوە، بەڵام بەر لەوەی بتوانێ دەستی خۆی بوەشێنێ، ژۆزفا لە خەو راپەری لە چاوترکانێکدا مەچەکی گرت.

سەرئەنجام پەنجەکانی برینداربوون و هاواری لێ بەرزبووەوە، ئەمیلیانۆ بەدەنگی هاوارەکەی ئەو لە خەو راپەری و لە جێیەکەی هەڵساو

چەقۆکەی لە دەستی سلدادرا هەڵدا و کەوتە سەرزەوی ژوورەکە، دوو سەربازی چەکدار خۆیان کرد بەژووردا لەملا و ئەولای سلدادرا وەستان، ئەمیلیانۆ بەسەر سوڕمانەوە گوتی:

ـ سەر لەم کارە دەرناکەم، نازانم هۆی ئەم کارە چی بوو؟

سلدادرا بە توڕەیی و نەفرەتەوە سەیری دەکرد و هیچی نەدەگوت:

ئەمیلیانۆ فەرمانی دایە سەربازەکان

ـ بیبەنە دەرێ

سەربازەکان سلدادرایان بردە دەرێ.

ئەمیلیانۆ، سەیری دەستە بریندارەکەی ژۆزفای کرد، پاشان بە دەسماڵە سپییەکەی گەردنی خۆی برینەکەی بەست، بە بێ شەرم کردن دەستی بەگریان کرد ژۆزفا بەنیگەرانییەوە سەیری دەکرد. ئەمیلیانۆ بە گریانەوە گوتی:

ئەو خەڵکی هەمان گوندە، من بەر لە پاپلۆ دەمناسی.

ژۆزفا دەستی بەسەر پشتە روتەکەی ئەمیلیانۆ هێنا و گوتی:

ـ بخەوە.. ئارام بە.. تۆ دەبێ بخەوی.

ئەمیلیانۆ گوتی:

ـ دەبێ تەواو بێت، ئەم کوشتار و خوێنرێژییە، دەبێ تەواو بێت پاپلۆ دەیگوت:

تەنها کارێ من دەیزانم پیاو کوژییە.. حەقیش بەو بوو، پاشان هەڵساو بەرەو دەرگا چوو، یەکێ لە سەربازە چەکدارەکان ڕووی تفەنگی کردبووە سلدادرا کە لە گۆشەی دیوارەکەدا راگیرا بوو خەریك بوو پەلەپیتکە بترازێنێ، ئەمیلیانۆ هاواری کردە سەربازەکە و گوتی:

ـ نەکەی.. لێی دوور کەوە.

لە تەنیشتی سلدادرا لەسەر چۆك دانیشت و بەدەنگێكی خەم ئامێزەوە گوتی:

ـ تۆ دەبێ درك بەوە بكەی. من ناچار بووم مێردەكەت بكوژم.

نەفرەت و توڕەبوون لەسەر روخسارە رەنگپەڕیوەكەی سلداردرا شەپۆلی دەدا.. ئەمیلیانۆ بەردەوام بوو

ـ ئەو خائین بوو.

ـ ئەو دۆست و هاورێی تۆ بوو.

ـ بەڵام بەڵگەمان هەبوو كە ئەو خیانەتی لێكردین.

سلدادرا بە هەموو هێزی خۆیەوە تفێكی كردە روخساری ئەمیلیانۆ. سەربازەكە ڕووی تفەنگەكەی كردەوە سلدادرا و چاوەرانی فەرمان بوو، ئەمیلیانۆ دەستی بەرز كردەوەو پێی گوت:

ـ نەء

ـ ژەنەراڵ، ئەم ژنە شێتە، ترسناكە

ئەمیلیانۆ بەتوڕەییەوە گوتی:

كاتێ كە ئەمیلیانۆ بەرەو ژوورەكەی خۆی گەڕایەوە، سلدادرا، بەبێ ئەوەی ئاوڕبداتەوە بەئاسپایی لە نێو تاریكی شەوی بێ پایاندا ون بوو..

ژەنــەراڵ هـورتـا شكستـی هـێنـا، دووبــارە ئـاشتـی بـەرقـەرار بـووەوە هــەمـوو دەیـانـووت، تـەنـهـا كـەسێ سوودی تـایـبـەتـی لـە دەسەڵاتـی خۆی وەرنەگرتووە و شایستەیە ببێتە سەرۆك كۆمار ئەمیلیانۆ زاپاتایە كاتێ كە پانچۆمیلا هاتە شاری مەكسیكۆ، زاپاتای بینی، هەمان ڕای لا دروست بوو، بەم شێوەیە ئەمیلیانۆ زاپاتا بووە سەرۆك كـۆمـاری مـەكسیك. بـەڵام ژۆزفـا هــەر لـەدێی (ئـەیـالا)دا مایەوە، چاوەرێی ئەو ڕۆژەی دەكرد مێردەكەی بگەڕێتەوە، ژیانی ڕابوردوویان سەر لە نوێ دووبارەكەنەوە. بەڵام، ڕۆژان و مانگان بە پەلە تێدەپەڕین. زاپاتا یەك كاری هەبوو، ئەویش خەڵك بینین، هەژار، دەوڵەمەند، دەچوونە دیدەنیی، هەریەكە ویست و تكاێكی هــەبـوو. نـامـەكـانـی ئیمزا دەكرد، بڕیـاری سەربـازی دەردەكرد، كوشتار سەر لە نوێ دەستی پێ كردەوە، وەك ئەوەی كە پیاو كوژی كارێكی بێ كۆتایی بێ.

ئەو ڕۆژە ژووری كاری سەرۆك كۆمار گەلێ قەرەباڵغ بوو، سەربـاز و سیـاسی و لادێیـی لـەوێدا كـۆبـبـونـەوە. ژەنـەڕاڵـێكـی پـیـریشی لـێ بـوو. سكرتێرەكە لەبەردەم ئەمیلیانۆدا وەستا خەریكی خوێندنەوەی ڕاپۆرتێ بوو، لە پشتی سەرۆك كۆمارەوە فرناندۆ دەبینرا، نەفرەت و توڕەیی لە چاوانییەوە دادەبارین. سكرتێرەكە ئەمەی لەڕاپۆرتەكە خوێندەوە جەنابی سەرۆك كۆمار بەپێی ئەو هەواڵانەی كە گەیشتووەتە دەستمان، هەندێ ئەفسەرانی ناڕازی لەشاری سۆتیلۆدا كۆبووونەوە، نیازی خراپیـان هەبوو بەڵام ژەنەراڵ جاوز بەپێی بریاری ئێوە بەسەربـازانی سوارە، لە شەوێكدا هێرشی بردە سەریان و گەمارۆی دان و یاخی بوونەكەی سەرنگون كرد،

ناوی هەموو ئەفسەرە کوژراوەکان لە پاشکۆی ئەم راپۆرتەدایە

ئەمیلیانۆ لە ڕوی تەوازوعەوە سەری راتەکان و گوتی:

ـ من تەنها ژەنەراڵم لەمە بەدوا هەر بەنێوی ژەنەراڵەوە ناوم بێنن

فرناندۆ گوتی:

ـ ئایا هەموو ئەفسەرەکان کوژراون؟

سکرتێرەکە وەڵامی دایەوە

ـ بەڵێ..هەموویان

فرناندۆ گوتی:

ـ کەوابێ بروسکەی پیدۆزبایی بۆ ژەنەڕاڵ جاوز بنێرن.

پاشان رووی کردە ژەنەراڵە پیرەکە و گوتی:

ـ راپۆرتی ئێوە دەربارەی دوژمنان چییە؟

ژەنەراڵەکە هەڵسا و گوتی:

ـ ژەنەراڵ (ئوبر کون) لە شاری پوئیلادا سەنگەر بەندی کردووە.. شکست پێ هێنانی کارێکی ئاسان نیە. ئەو ئەفسەرێکی شەرەفمەند و لێهاتووە. ئەگەر بەجەسارەتی نەزانن پێشنیازی ئەوە دەکەم، ئاشتی لەگەڵدا بەرپاکەن، چونکە لە بەرژەوەندی ئێمەدایە. هەروەها دەبێ بناغەی ئاشتی دارێژین، چونکە خەباتمان لەپێناویدا کردووە.

ئەمیلیانۆ گوتی:

ـ سوپاسی ئەم وەبیر هێنانەوەت دەکەم.

کاتێ ژەنەراڵ لە ژوورەکە دەرچووە دەرێ. فرناندۆ هەناسەیێکی هەڵکێشا و بەسکرتێرەکەی گوت:

ـ کاری دیمان چییە؟

ـ هەیئەیێك لە خەڵكانی (ئەیالا) زوڵمیان لێکراوە.

پاشان پارچە کاغەزێکی دایە دەستی ئەمیلیانۆ و گوتی:

ـ ئەمیش ناوەکانیانە

ئەمیلیانۆ سەیرێکی ناوەکانی کرد و زەردەخەنەیێك لێوەکانی لەیەك ترازاند لە چاوی تروکانێکدا، نیشانەی لاویێتی و خۆشخاڵی مناڵانە نیشتە سەر روخساری، دایە قاقای پێکەنین:

ـ کارلیتۆ.. لازارۆ.. چەند خۆشحاڵم بەدیدەنیتان.. چ کارێکم لەدەست دێ بۆ ئێوەی بکەم؟

نوێنەران، بەڕانمایی لازارۆ بەرەو ژورەکە هاتن. دوو دڵییان پێوە دیار بوو، بەڵام گەنجێکی پێست تەڵخ کە بەرگێکی سادەی لەبەردابوو هەندێ دواکەوتبوو، وەکو ئەوانی دی دوو دڵی ڕێی بۆ دەرونی نەبردبوو، لە قەڵافەتی و رەفتاری جۆرە غرور و باوەر توندی و ئیرادەی بەرزی دەبینرا. لازارۆ دەستی بەقسان کردو گوتی:

ـ گەلێ داوای لێبوردنت لێ دەکەین ژەنەراڵ، ئێمە هاتووین شکات لە ئۆفیمۆی برات بکەین.

زەردەخەنەکە لەسەر لێوانی ئەمیلیانۆدا خامۆش بووەوە. نوێنەران بەجارێ هەموویان دەستیان بەقسان کرد، یەکێکیان گوتی:

ـ ئەو مولکەی کەئیوە بۆمنتان گەڕانەوە، ئەو داگیری کردووە

یەکێکی دییان گوتی:

ـ ئەو ئێمەی دەرکردووە.

یەکێکیان دییان گوتی:

ـ پیاوێکی کوشتووە و زەوییەکانمان ناداتەوە.

ئەمیلیانۆ پرسیاری کرد

ـ لازارۆ..ئەم ڕووداوانە ڕاستن؟

لازارۆی پیر گوتی:

ـ بەڵێ ژەنەراڵ، هەمووی راستن.

ئەمیلیانۆ بەناڕەزاییەوە گوتی:

ـ ئەڵبەتە دەبێ لەو ڕووەوە کارێ بکەین بەڵام ئێوە دەبێ ماوەم بدەنێ..

لەم کاتەدا گەنجە پێست تەڵخەکە یەك هەنگاو بەرەو پێش چوو دەستی بەقسان کرد. دەنگەکەی ڕێك لەو دەنگەی زاپاتا دەچوو کە ڕۆژێ بۆ یەکەم جار لەگەڵ جوتیاراندا بەرانبەر بە پورفیرودیاز وەستا وشکاتی لەموڵکدارەکان کرد.

گەنجەکە گوتی:

ـ رەعیەت ناتوانێ سەبر بکات. ئەوان زەویان کێڵاوە و تۆویان وەشاندووە.

سکە برسیەکانیان ناتوانێت سەبر بکات

ئەمیلیانۆ بەتوڕەبوونێکی ئاشکراوە گوتی:

ـ ناوی تۆ چییە؟

گەنجەکە سەری دانەواندەوە گوتی:

ـ هوان هرناندز.

ئەمیلیانۆ بەبێ ئیرادە قەڵەمێکی لەسەر مێزەکە هەڵگرت و لەسەر لیستی ناوی نوێنەرەکان، بازنەیێکی بەدەوری ناوەکەی ئەودا هێنا، پاشان بە سەرسوڕمان و ترسەوە هەستی کرد چ کارێکی سەیری لە دەست دەرچووە، نیشانەی دیکتاتۆری وردە وردە لێی دەردەکەوت، دەستی لەرزاو پەنجەکانی قەڵەمەکەی شکاند و کاغەزەکەی قەمچ کرد و توڕی هەڵدایە گۆشەیێکی ژورەکە. هەڵساو شەبەقەکەی لەسەرنا، فرناندۆ جورئەتی دایە

خۆی و پرسیاری کرد.

ـ بۆ کوێ دەچیت؟

ـ دەچمە ماڵ. وەك شتێ لەوێ رویدابێ منیش فەرامۆشم کردبێ..

ـ ئەگەر تەلاری سەرۆك کۆمار جێ بێڵی، دوژمنەکانت سبەی لێرە دەبن و نایەڵن زۆر بژیت.

ئەمیلیانۆ لەڕووی ماندووبوونەوە زەردەی هاتێ و گوتی:

ـ دەزانم

ـ لەگەڵ ئەمەشدا ئەگەر ئێستا بڕۆیت من لەگەڵتاناییم

ئەمیلیانۆ لەبەرانبەریدا وەستا بەحەسرەتەوە گوتی:

ـ من پێویستیم بەتۆ نیە. ئێستا ڕووە راستەقینەکەی تۆم بۆ دەرکەوت، دەزانم هەموو هونەرێکی تۆ، گێرەشێواندن و لە نێو بردنی خەڵکە. پاش ڕۆیشتنی من بێ گومان کە دەچیتە لای ژەنەراڵ ئوبر گون، بەکۆمەکی ئەو بەردەوامی بە قەتل و عامی مەردوم دەدەی..ئامانجی تۆ تەنها ئەمانەیە..تۆ تەنها پیاو کوژی و حەزت لە کوشتن و بڕین و شڕەخۆرییە.

پاشان ڕووی بەرەو لای لادێیەکان وەرچەرخاند و گوتی:

ـ بابڕۆین.

نوێنەرانی گوندی (ئەیالا) کەوتنە دوویەوە. گەنجە پێست تەڵخەکە دروست یەك هەنگاو کەوتبووە پشتیەوە، ئەو ئێستا تێگەیشت کە ژەنەراڵ ئەمیلیانۆ زاپاتا جیاوازی زۆرە لەگەڵ ئەو دیکتاتۆرانەی حوکمی مەکسیکیان دەکرد.

فرناندۆ بەتوڕەییەوە سەیری چوونە دەرەوەیانی دەکرد، پاشان لە ڕووی نائومێدییەوە، تفێکی هەڵدایە سەردیوارەکەی بەرانبەر.

## ٢٠

هەر لە دەرگا گەورەکەوە تا نێو ژورەکان، تەپ و تۆزێکی زۆریان بەسەرەوە بوو بەراز و مریشکەکان لەسەر قاڵیچەرەنگ بوواردووەکاندا تەراتێنیان دەکرد شوشەی پەنجەرەکان شکابوون، کورسیەکان چەورابیان بەسەرەوە بوو، دیوارەکان بە چڵم و تف سواخ درابوون، قاپەکان نیوە خاڵی بوون، بتڵی بەتاڵ لەسەر مێزەکەدا بەلایا کەوتبوون.

لە گۆشەیێکی تاریکی ژورەکەدا ئۆفیمۆ بەدمەست بوو لەسەر کەرەوێتەیێکدا ڕاکشابوو، کاتێ کە ئەمیلیانۆ و نوێنەرانی چوونە ژوورەوە ئۆفیمۆ چاوەکانی کردەوە هەر کە ئەمانی بینی بەبێ ئیرادە دەستی بۆ دەمانچەکەی برد و گوتی:

ـ برا..ئاگات لە خۆت بێ قسەی بێ سەر و بەرم پێ نەڵێی.

وشەکان لەسەر لێوە قورسەکانیا بەزەحمەت دەهاتە دەر. ئەمیلیانۆ گوتی:

ـ ئۆفیمۆ راستە تۆ زەوی ئەمانت بە زۆر داگیر کردووە؟

ئۆفیمۆ بەدەستی راست نەوازشی دەمانچەکەی کرد، گوتی:

ـ من هەرچییەکم ویستبێ، لەمانم سەندووە، تەنانەت سواری ژنەکانیشیان بووم پاشان بە پێکەنینێکی تەوس ئامێز، بە یەکێ لە دێهاتیەکانی گوت:

ـ وەرە ئێرە.

لە پشتی کەرەوێتەکەوە ئافرەتێکی پێست سور بەشەرمەوە هاتە پێشی، ئەو پیاوەی کە ئۆفیمۆ بەتەوسەوە بۆی پێکەنی بوو، مێردی ئەم ژنە بوو..مێردەکەی یەکسەر میلی تفەنگی هێنایەوە لەبەر توڕەیی و شەرم، دگانەکانی جیڕەوە کرد.

ئەمیلیانۆ بەنارەحەتی و نەفرەتەوە بەبراکەی گوت:

ـ تۆ چ حەیوانێکی؟

ـ من پیاوم، نەك ئادەمێکی بێ دەست و پێی وەك براکەم کە هیچ شتێکی بۆ خۆی هەڵنەگرتووە، من لە دوا جەنگەکاندا عارەق و خوێنم ڕشتووە، من ژەنەراڵم بەڵام دەبا بۆ پاروە نانێ دەستی گەدایی لەو کەسانە پانکەمەوە کە بەشداری جەنگیان نەکردووە..ئەو سەردەمە نەما، هەر شتێکم ویستبێ کردوومە.

پاشان ڕووی کردە لای ژنە لادێیەکە و گوتی:

ـ لەگەڵمدا وەرە.

ژنە سوور پێستەکە کەوتە دووی بەڕاڕەوەکەدا ڕۆیشتن، ئەمیلیانۆ ڕووی وەرچەرخاندە لای مێردی ژنەکە، لە کاتی قسەکردندا سەیری ئەو پیاوەی دەکرد، بەڵام قسەکانی راستەو راست بۆ گەنجە پێست تەڵخەکە واتە (هرناندز) بوو، گوتی:

ـ ئێوە بەدووی رابەرانی گەورەدا دەگەڕان، کە بەهێز و بە توانا و بێ خەتابێ، بەڵام ئەو جۆرە رابەرانە هەرگیز پەیدا نابن، ئەوانە کەسانی وەکو ئێوەن، دەگۆڕێن، میللەت لە بیر دەکەن و دەمرن، لە راستیدا رابەری حەقیقی ئێوە خودی خۆتانن.

ئەو مێردەی خیانەتی لێکرابوو بەرەو ڕاڕەوەکە چوو، ئۆفیمۆ کوڵە پشتەکەی هەڵگرت، لەبەر مەستی لەتری دەدا، لەژورێکی چکۆلەی ئەو سەری ڕاڕەوەکە هاتە دەرێ، ژنە لادێیەکەی دابووە بەر، لەدەرگای ئەو سەری ڕاڕەوەکەوە پاڵێکی پێوەنا..کاتێ کە چاوی بەر چاوی خوێنگرتووی مێردەکە کەوت. لەیەك کاتدا هەردووکیان هاتنە دەست و تەقەیان لە یەکدی کرد. ژنەکە هاواری کرد بەرەو لای مێردەکەی، کە خەریك بوو دەکەوت رایکرد، ئۆفیمۆ بەزەحمەت توانی لە گۆشەی دیوارەکەوە خۆی

بگەیێنێتە دەرگاکە کاتێ کە ئەمیلیانۆ بەرەو لای ئۆفیمۆ ڕایکرد. ئۆفیمۆ لە دەرگا چووە دەرێ لەسەر پێپلیکانەکانەوە تلۆر بووەوە، ئەمیلیانۆ خۆی گەیاندە سەر ئۆفیمۆ. سەربازێ کەلەوێدا وەستابوو سەیرێکی ئەمیلیانۆی کرد و پێی گوت:

ـ ئەو ژەنەراڵ بوو، ئێمە وەکو ژەنەراڵێ دەیخەینە قەبرەوە.

ئەمیلیانۆ گوتی:

ـ بەڵام نەك گۆڕستانی سەربازی، چونکە ئەو لە مەیدانی جەنگدا نەکوژراوە جەستەی لەگەڵ خۆمدا بۆ ماڵێ دەبەمەوە.

پاشان لەتەنیشتی تەرمی براکەی چۆکی دادایە سەر زەوی، بەگریانەوە سەری نایە سەر سینگە خوێناوییەکەی.

## ٢١

دەیانگوت ژەنەراڵ پورفیریودیاز لە پاریس دایە و ژەنەراڵ هۆرتا کوژراوە و ژەنراڵێکی گەنج، بێ رەحم لە جێگەی ئەمیلیانۆ زاپاتا بووەتە سەرۆك کۆماری مەکسیك. دەیانگوت پیاو کوژێکی خوێن ڕێژە. حوکمی کوشتنی ئەمیلیانۆ زاپاتای ئیمزا کردووە، فەرمانی دابوو بەهەر شێوەیێك بووە دەبێ لە ناوچێ، تەنانەت ئەگەر پێویستی کرد هەموو خەڵکانی مورەلوس قەتل و عام بکرێن و خانووەکانیان بسوتێنرێ ئامانج دەستگیرکردن و کوشتنی زاپاتا بوو، هێشتا خەڵك خەباتی دەکرد، خانووەکانیان دەسوتێنرا، بەڵام خانووی دییان دروست کردەوە، منداڵەکانیان دەکوژران بەڵام منداڵی نوێیان دەهێنایە دنیاوە. لە دێهاتەکان دەرکرابوون بەناچاری لە دامێنی چیاکاندا ژیانیان دەگوزەراند. بەڵام خەباتی مەردم بەردەوامی هەبوو.

کاتێك کە سەربازەکان لە پشکنینی دێی مورەلوس بوونەوە، هەموویان لە مەیدانی دێیەکەدا کۆبونەوە، تا ئاگاداری فەرماندەکەی خۆیان بکەن، کە چ کەسێکیان نەدۆزیوەتەوە لە پڕ لە ماڵێکدا دەنگ بەرز بووەوە. ئەفسەرێکی گەنج، پرەمێردێکی هێنایە دەر پیرەمێردە لاوازەکە هەوڵی دەدا خۆی لەسەردارەکەی دەستی راگرێ. ئەفسەرە کە بەخۆشحاڵییەوە ڕووی لە فەرماندە کرد و گوتی:

ـ قوربان من کەسێکم پەیدا کرد.

پیرەمێردەکە لازارۆ بوو. بەرانبەر فەرماندە راست راوەستا و گوتی:

ـ ژەنەراڵ من خۆم تەسلیم دەکەم

فەرماندە گوتی:

ـ زاپاتا لە کوێیە؟

لازارۆ ڕووی بەرەو لای گردە ئەرخەوانیەکان وەرچەرخاند و گوتی:

بۆچی بە دووی ئەو گردەکان ناگەڕێن؟ بیستم کە هەفتەی ڕابورد و چەند سەربازێکی ئێوە ڕووەو گردەکان چون، نەگەڕانەوە..ژەنەراڵ ئەمە راستە.

ژەنەراڵ بەپشتی دەستی کێشایە ناو دەمی پیرەمێرد کەوتە سەرزەوی، لازارۆ سەری بەرزکردەوە خوێنی دەم و دگانەکانی پاککردەوە گوتی:

ـ من گەلێ پیرم لەوەی کەترسم لە مردن هەبێ.

ئەفسەرە گەنجەکە، ئامادە وەستا و پرسیاری لە فەرماندە کرد

ـ قوربان چ ئەمرێ دەدەی؟

ـ فەرماندە گوتی:

ـ من ئەمرێکم نیە بیدەم دوژمنێ کە بە چاو نەبینرێت، هەرگیز ناتوانرێ هیچی لەگەڵدا بکرێ.

ئەفسەرەکە بەتورەیی و غەزەبەوە نەراندی
ـ دێیەکە بسوتێنن.

## ٢٢

تفاق و مێزی ژوورەکە کە پێشتر ئەمیلیانۆ زاپاتا وەك سەرۆك کۆمار لەسەری دادەنیشت، دەستی لێ نەدرابوو وەکو خۆی مابووەوە، تەنانەت فرناندۆیش بەباوەشێ کاغەز و راپۆرتەوە، لە تەنیشتی مێزەکەدا وەستابوو، تەنها ئونیفورمەکەی گۆرابوو. ئەمجارە ئونیفۆرمێکی لەبەردابوو کەوەك ئونیفۆرمی سەرۆك کۆماری ئێستای مەکسیك وابوو کەلە و لای مێزەکەدا دانیشتبوو.

سەرۆك کۆمار گوتی:

بۆیان نووسیبووم، پیاوانی ئێمە نەك تەنها نەیانتوانی زاپاتا پەیدا بکەن رووی نەداوە لەگەڵ دوژمنێکی نادیاردا بجەنگم، بزەییێك لێوەکانی فرناندۆی لێك ترازاند و گوتی:

ـ دەتوانین زاپاتایش بکوژین، من ئێستا شێوە و نەخشەی کوشتنەکەیتان نیشان دەدەم.

پاشان بەرەو دەرگا چووە. کەسێ لە دەرێدا چاوەرێی فەرمان بوو، قسەی لەگەڵدا کرد و پاشان بەدەنگی بەرز پێی گوت:

ـ سەرهەنگ گاهاردو تکا دەکەم بێنە ژورێ.

سەرهەنگ گاهادرو ئۆنیفۆرمێکی[٢] چڵکن و ئوتی نەکراوی لەبەردا بوو، هاتە ژوورێ سەروچاوی نەشۆردبوو، تەراشی نەکردبوو، بەزەحمەت

(٢) ئونیفورم: پۆشاکی سەربازی– الزی الموحد

دەیتوانی دەسەڵات بەسەر لەرزینی دەستەکانیا بگرێ. وردە دەماری سور لە نێو سپێنی چاوەکانیا ئەوی دەردەخست کەمودمینی مەیە.

فرناندۆ گوتی:

ـ سەرهەنگ گاهاردو. فەرمون دانیشن.

سەرهەنگی هەمیشە مەست بەزەحمەت توانی لەسەر کورسییەکی دەسك دار دانیشێ و چاوانی بڕییە گۆشەیێکی ژوورەکە.

فرناندۆ گوتی:

ـ چاك فکرت لە پێشنیارەکەی من کردووەتەوە؟

سەرهەنگ، بەدەنگێك کە دەتووت لە قوڵایی چاڵەوە دێتە دەر گوتی:

ـ من کەسێکی عەسکەریم، تا ئێستا لەم کارانەم نەکردووە

فرناندۆ بەبێ حەوسەڵییەوە گوتی:

ـ لەبەر ئەوەی کە تۆ عەسکەریت، دەبێ بزانیت هەمیشە ئامانجی جەنگ سەرکەوتنە.

سەرکەوتن بەهەر نرخێ بێ.

سەرهەنگی پیر چاوی بڕییە بتڵەشەرابێ ـ لەسەر میزەکە دانرابوو ـ پاش ئەوەی زمانی بەلێوەکانیا هێنا، گوتی:

ـ دەکرێ پێکێ..

فرناندۆ بەبزەوە گوتی:

ـ ئەڵبەتە..بەڵام پاش ئەوەی بڕیاری خۆت دەدەی

سەرهەنگ هەوڵی دەدا کۆنترۆڵی دەنگی خۆی بکات، گوتی:

ـ ئەگەر پێشنیارەکەی ئێوە ڕەت کەمەوە، ئەڵبەتە دەمخەنە ژێر چاودێرییەوە. وانییە؟

ـ ئەڵبەتە وایە

سەرهەنگ، پەنجە لەرزۆکەکانی بەروخسارە نەتراشراوەکەیدا هێناو گوتی:

ـ ئەگەر بشمەوێ فیرار بکەم لە پشتەوە دەمدەنە بەر دەسترێژ.. وانییە؟

ـ ئەی چۆن..هەروایە.

ـ کەوابێ ناتوانم پێشنیازەکەی ئێوە ڕەت کەمەوە.

فرناندۆ بەبزەوە پێی گوت:

تۆ پیاوێکی زیرەکی سەرهەنگ.. مەشروبەکەت بنۆشە.

## ٢٣

جگە لە تریفەی مانگ کە لە پەنجەرەی ژوورەکەوە دەچووە ژورێ، باقی ژورەکە نوقمی تاریکی ببوو، لە دورەوە دەنگی تەقەی تفەنگێك بیسترا، هەردوا بەدوای تەقەکە دەنگی چوار ناڵەی ئەسپ و چەند دەقیقەیێکیش پاش ئەم دەنگە لە دەرگا درا.

ژۆزفا لە ترسانا راپەڕی، چ شوێنەواری چاوانی گەش و لێوانی خەندان و پێست نەرمییەکەی نەمابوو، شوێنەواری نیگەرانی و ماندوو بوون جوانیەکەی لە نێو بردبوو، بەڵام ئەگەر کەسێ دیقەتی بدایێ دەیزانی کە ژنێکی دلڕفێن و ناسك بووە.

دەنگی دەرگاکە توندتر بوو، ئەمیلیانۆ لە جێیەکەی هەڵسا، پانتۆڵەکەی لەپێ کرد، دەمانچەکەی گرتە دەست و بەرەو دەرگاکە چوو.

سەرەتا بە ئاستەم دەرگاکەی کردەوە، هەر کە میوانەکەی ناسییەوە، هەناسەیێکی هەڵکێشا و بەتەواوی دەرگاکەی کردەوە، گەنجە پێست تەڵخەکە (هوان هرناندز) بە هەناسە بڕکێ و سەروچاوی عارەقاوی خۆی

کرد بەژوورا و بێ پێشەکی گوتی:

ـ تەقەمەنیەکانم بینی، سەیری تفەنگە نوێیەکانم کرد، هەندێکیان هێشتا تەقەیان نەکردووە، شەستیری سوك و قورسیشیان تێدایە.

ئەمیلیانۆ گلاسێ ئاوی ساردی دایە گەنجەکە و گوتی:

ـ ئەی فیشەك؟

ـ بە ئەندازەی کێوێك..

ـ بەڵام من تێناگەم، ئەم سەرهەنگ گاهاردویە بە چ هۆیێك ئیلتحاق بەئێمەوە دەکات؟. من سەر لەمە دەرناکەم.

هرناندز گلاسەکەی لەسەر مێزەکە دانا و بەپشتی دەست دەمی سڕییەوە و گوتی:

ـ سەرهەنگ گاهادرو دەڵێ بەبێ هۆ ڕوتبەیان لێ سەندووەتەوە، دەیەوێ تۆڵە لە دەوڵەت بکاتەوە.

ئەمیلیانۆ بەبەد گومانییەوە گوتی:

ـ بەڵام چۆن بەم ماوە کەمە توانیویەتی فەوجێکی پڕچەك بخاتە ژێر دەسەلاتی خۆی ـ پێم وایە ئەمە داوە و بۆ ئێمە تەنراوە.

هرناندز سەری بەنیشانەی سەلماندنی قسەکەی ئەمیلیانۆ راتەکاند و گوتی:

ـ بەڵێ مومکینە..دەشێ داوێکیان بۆ نابینەوە

ئەمیلیانۆ بە ئاسپایی گوتی:

ـ بەڵام دەشێ مەوزوعەکە راستییەکی تێدابێ. بەم هەموو چەك و تەقەمەنیە ئێمە دەتوانین تا ساڵێکی تر بەرگری بکەین.. رەنگە لە ماوەی ئەم ساڵەدا، کاغەز بەسودی ئێمە وەرگەڕێت، ئێمە دەبێ بەڵگەی پێویست دەربارەی راستگۆیی سەرهەنگ گاهادرۆ وەدەست بێنین، سبەی خۆرئاوا

بە ئەسپەکەی خۆت وەرەلام، خۆت بۆ سەفەرێکی درێژ ئامادەکە، منیش تا ئەو کاتە بڕیاری خۆم دەدەم.

پاشان دەرگاکەی لە پشت هرناندز بەست و گەڕایەوە بۆ لای ژۆزفا.

ژۆزفا گوتی:

ـ ئەمیلیانۆ هەموو شەوێ هەستێکی سەیر، روم تێدەکات، وەك دڵم خەبەری ئەوەم بداتێ کە تۆ بەم زووانە دەکوژرێی. لە کاتی ئاشتی و سەفادا نەمدەتوانی تۆ ببینم و لە دیدەنیت بەرخوداربم.

ئەمیلیانۆ، ژۆزفای بۆ لای خۆی کێشا دەستی خستە نێو زوڵفە شێواوەکانی و لێوانی ماچ کرد و پاشان گوتی:

ـ کەسێ بەناوی سەرهەنگ گادرو هەموو فەوج و ساز و بەرگ و سەربازەکانی خستووەتە ژێر دەسەڵاتی من، ئێمە گەلێ پێویستمان بەهێزی تازە نەفس هەیە.

ئەمیلیانۆ خۆشەویستم، نەچیتە لای ئەو، لەبەر خاتری من لێرەدا بمێنەوە. لەم بەزمە سەردەرناکەم. ئەمیلیانۆ مەڕۆ.

ئەمیلیانۆ تێفکری و گوتی:

ـ لە پێناوی تۆ و میللەتی مەکسیك، ئەوەی پێویست بێ دەبێ بیکەم.

سەیری پەنجەرەی ژوورەکەی کرد، کەڵەشێری خانووەکەی تەنیشتیان دەستی بە خوێندن کرد، زاپاتا گوتی:

ـ ئەگەر بچمە شار دوو کراسی جوانت بۆ دەکڕم.

ژۆزفا خۆی خستە ئامێزی ئەمیلیانۆوە.

کاتێ گزنگی هەتاو لە پشت گردە ئەرخەوانیەکانەوە سەری دەرهێنا ئەمیلیانۆ، جارێکی دی چپانیە گوێی ژۆزفا.

ـ لە پێناوی تۆ و میللەتی مەکسیك، ئەوەی پێویست بێ دەبێ بیکەم.

## ٢٤

ڕۆژێ تـێپـەڕی..دوو ڕۆژ تـێپـەڕیـی و..دووبـارە شەو بـووەوە...شەوێ کـە تریفەی زیوینی مانگ بەزەحمەت دەیتوانی زەوی و زەمان ڕۆشن کاتەوە.

ئـەمیلیـانۆ لـەبـەردەم مـاڵـەکـەیدا وەستـابـوو تـەمـاشای مـانگی دەکرد، ژۆزفـایش لـە تـەنیشتی ئـەو لـەسەر کـەرەوێتـەیێکدا دانیشتبـوو، شاڵێکی دابووە سەر شانەکانی.

شەوێکی سارد بوو. ئەمیلیانۆ گوتی:

ـ سەیرکە، چۆن هەورەکان بەسەر ڕووی مانگدا دەخزێن، مانگیش وەکو زەمان وایە و هەمیشە لە حەرەکەت دایە، بەڵام بۆ کوێ دەچێ؟ چ کەسێ دەزانێ.

ژۆزفا سەرنجێکی شێواوی تێگرت و گوتی:

ـ تۆ بڕیاری خۆت داوە، دەتەوێ لەگەڵ سەرهەنگ گادرو یەك بگری.

ئەمیلیانۆ هەوڵی دەدا چاوی بە چاوانی ئەو نەکەوێ، گوتی:

ـ مانگ چەنێ چکۆلەیە.

فـرمـێسك لـە چـاوانـی ژۆزفـا کـۆبـووەوە، دڵـۆپـە گـەرمـەکـانـی بـە گـۆنـا ڕەنگبوواردوەکەیدا هاتنە خوارێ گوتی:

ـ ئەگەر خوا نەخواستە بەڵاییێکت بێتە سەر، ئەم خەلکە چ دەکەن؟ ئیدی چی یان بۆ دەمێنێتەوە؟ هیچ شتێ..تێدەگەی؟ هیچ شتێ

ئەمیلیانۆ بەو دەستانەی کە هەتاو سووتانویەتی، فرمێسکەکانی بۆ سڕی و گوتی:

ـ ئەوان خاوەنی خۆیانن، ئەمە بەسە بۆ ئەوان.

ژۆزفا گوتی:

ـ هـیـچ شتـێ نـەگـۆڕاوە..لـەگـەڵ ئـەم هـەمـوو جـەنگ و خـوێنـڕێژی و دەربەدەری و ئاوارەییە..هیچ شتێ نەگۆڕاوە.

ئەمیلیانۆ دەستی خستە سەرشانەکانی ژۆزفا، بەزەردەخەنەیەك گوتی:

ـ بە هەڵەدا چوویت. خەڵکەکە گۆڕاون، باری ژیان و شتەکانی دی وردە وردە بەهۆی ئەوانەوە گۆڕاون. ئەوان ئیدی پێویستیان بەمن نییە، میللەتی مەکسیك میللەتێکی بەهێز و قاڵ بووە پێویستی بەڕابەرانی خەتاکارنییە.

لەم کاتەدا هرناندز گەیشتە جێ، هەر کە لە ئەسپەکە دابەزی و گوتی:

ـ گاهاردو، ئەزموونی خۆی دا، وەك ئێوە بریارتان دابوو، بەوم گوت کارەبایەکانی شاری (هوتوکاتەبك) لەناو ببات، وای کرد تەقەمەنی کەڵەك کردووە، چاوەڕێی تۆیە.

ئەمیلیانۆ بێدەنگ بوو، ژۆزفا هەناسەی لە سینەدا حەپس کرد، بەچاو تروکاندنێ پیری و پەشێوی بەروخساریا دەرکەوت. ئەمیلیانۆ پرسیاری لە هرناندز کرد ئەو شتانەی کەئێوە بڕیارتان لەسەردابوو، ئەو جێ بەجێی کرد.

ئەمیلیانۆ گوتی:

ـ کەوابێ ئەمشەو دەبێ من بچمەلای، لە شەودا وەزع باشترە.

ئوتیلانۆ.

سەربازێ کە ناوی ئۆتیلانۆ بوو بە ئەسپێکی قاوەییەوە، بەڕاکردن هاتە پێش، ئەمیلیانۆ هەوڵی دا لەگەڵ ژۆزفا کەبێ جوڵە دانیشتبوو قسان بکات بەڵام وەك ئەوەی وشەکان لەنێو دەمیا مەیی بن، هیچی نەگوت، ئەوی هی گوتن بوو لەگەڵ یەکدیدا باسیان کردبوو. جارێکی دی سەیری ژۆزفای کرد بەپەلە خۆی هەڵدایە سەر ئەسپە قاوەییەکە، ژۆزفا هاواری کرد و

ڕووەو ئەو ڕایکرد، ئەمیلیانۆ لەسەر ئەسپەکەوە چەمییەوە، چەناگەی گرتە نێو لەپ، لەم کاتەدا ئەو ژوورەی کەوتەوە بیر کەلە میحرابی کڵێساکەدا، کەشیشێکی پیر مارەی بڕین و ڕۆحی ئەم دوو کەسەی بۆ هەمیشە بەیەکەوە بەست، ئەمیلیانۆ خۆی بە بەرپرس دەزانی بەرانبەر بە ژۆزفا پێی گوت:

ـ ترست نەبێ، من دەگەڕێمەوە بۆ لات، دوو کراسی جوانت بەدیاری بۆ دەهێنم.

پاشان لەگەڵ هرناندز لەنێو تاریکی شەودا لە چاو ون بوون، لەم کاتەدا مانگ لەژێر پەڵە هەورێکدا پەنهان بوو، چەقەڵێك لە دوورەوە لوراندنی، فرمێسك لە چاونی ژۆزفادا کۆبووەوە.

## ٢٥

ڕۆژ ببووەوە بەڵام هەتاو دیارنەبوو، بایێکی سارد لە حەوشەی قەڵاکەدا هاژەی دەهات و دەنگی ترس ئامێزی دەکێشایە قەد دەرودیوارەوە. پیاوانی زاپاتا گۆشەو کەناری قەڵاکەیان پشکنی بوو، چ کەسێکیان نەدی بوو.

کاتێ کە زاپاتا نزیکی دەرگای قەڵاکە بووەوە بەئیشارەتی سەر تێیان گەیاند، کە چ داوێکیان بۆ نەتەنیوە و دەتوانێ بچێتە نێو قەڵاکە. ئەمیلیانۆ بەسواری ئەسپە قاوەییەکەی گەیشتە دەرگای قەڵاو لەژێر تاقی دەرگاکەوە چوو نێو مەیدانی تەپ و تۆزاوی قەڵاکە. لەم کاتەدا سەرهەنگ گاهادرۆ، لە یەکێ لەژوورەکانی قەڵاکەوە هاتە دەر ئەمجارەیان ڕیشی تاشی بوو ئونیفۆرمێکی پاکی لەبەر کردبوو بەڵام هێشتا دەمارە سورەکانی خوێن لە نێو سپێنی چاوەکانیا دیار بوون.

چاوانی ئەمیلیانۆ یەکسەر نیشتە سەر ئەسپێ کە بە دەستی گاهاردو وە

بوو، ئەو ئەسپە پلانكۆ بوو. زاپاتا لەسەر ئەسپەكەی خۆی دابەزی و ڕای كردە لای پلانكۆ و سەرهەنگ گاهاردو، زەردەخەنەیێك روخسارە خەم ئامێزەكەی گەشاندەوە. هەر كە گەیشتە لای سەرهەنگ گاهاردو رەشمەی پلانكۆ و لموزی گرت، پاشان گوتی:

ـ پلانكۆت لەكوێ پەیدا كرد.

ـ یەكێ لە ئەفسەرەكانی من پەیدای كردبوو، بەلام من لێم وەرگرت و بۆ تۆم هێنا ئەمیلیانۆ دایە قاقا، دەستی بەسەر پلانكۆ كێشا، بەگاڵتەوە گوتی:

ـ پلانكۆ..پلانكۆ تۆ پیربوویت، وەكو من ئێستا تۆیش پیری

جارێكی دی روخساری خستە نێو باڵی پلانكۆ بەبێ شەرم كردن فرمێسكی گەش لەچاوانیەوە هاتە خوارێ. لەو كاتەدا كە ئەمیلیانۆ سەری بەیالی پلانكۆ پۆشرابوو و ڕازو نیازی لەگەڵ ئەسپە خۆشەویستەكەیدا دەكرد، سەرهەنگ گاهاردو بەبێ دەنگ خۆی گەیاندە دیوارێكی پەنا قەلاكە، كە وەك پەناگا وابوو، بەرلەوەی لەپشتی دیوارەكە پەنهان بێ، بە كەمالی رێزەوە سلاوی بۆ ئەمیلیانۆ كرد، هەر لەم كاتەدا هەندێ سەربازی چەكدار لەپشتی گوێسەبانەكانی قەلاكەوە دەركەوتن.

سەرهەنگ گاهاردو، جارێكی دی دەستی بۆ لای روخساری خۆی برد لەپەنا دیوارەكەدا خۆی شاردەوە، سەربازە چەكدارەكان ڕووەو ئەمیلیانۆ و ئەسپەكەی سیرەیان گرت و بەیەكەوە دەسرێژیان كرد.

ئەمیلیانۆ كە غافڵگیر كرابوو، لەم كاتە ناسكەدا چەند گوللەیێكی بەركەوت، دەمانچەكەی لە كیف دەرهێنا، لەو كاتەی كەخەریك بوو دەكەوت، بەبێ نیشانە گرتن چەند تەقەیێكی كرد.

لەسەربانی قەلاكەوە سەربازەكان دووبارە دەسترێژیان كردەوە. پلانكۆ لە ترسی تەقەكان بە چوارناڵە بەرەو دەرگای قەلاكە غاری دا، جارێكی

دی ئەمیلیانۆ بەبێ نیشان گرتن فیشەکێکی تەقاند. روح جەستەی جێ هێشت لە حەوشەی قەڵاکەدا کەوتە زەوی و بۆ هەمیشە بێ جوڵە مایەوە.

کاتێ پلانکۆ ڕووەو دەرگای قەڵا غاری دەدا، فرناندۆ کە تا ئەم کاتە فرمانی دەستریژکردنی دەدایە سەربازەکان، شێت ئاسا هاواری کرد.

ـ ئەسپەکە بکوژن. نەیەڵن دەرباز بێت.

سەربازەکان چەند تەقەیەکیان رووەو ئەسپەکە کرد، بەڵام تازە درەنگ بوو، پلانکۆ لەدەرگای قەڵاکە چووە دەرێ لە چاو ون بوو. فرناندۆ لەناردوانی سەربانەکەوە هاتە خوارێ و هاواری کرد.

ـ ئەم خەڵکە گەلێ باوەریان بە خەرافات هەیە، ئێمە نەدەبا لێگەڕاباین ئەسپەکەی زاپاتا دەربازبێت.

سەرهەنگ گاهاردو، کە مەعلوم نەبوو لەنێو ئەم بەزم و رەزمەدا شەرابی لە کوێ وەدەست هێنابوو، مژی قوڵ قوڵی بەشوشەکەوە دەنا، لە تەنیشتی فرناندۆ وەستا سەیری جەستەی بێ جوڵە و کون کونەکەی ئەمیلیانۆ دەکرد.

سێبەری خەم و پەشیمانی لە چاوانیا دەرکەوت، گوتی:

ـ پڵنگیش کوژرا، جەستەی وەك بێژن کون کون بووە.

ـ فرناندۆ بەلوت بەرزییێکی تایبەتیەوە گوتی:

ـ ئەمیش کۆتایی کارەکەی ئەو. ئیدی زاپاتاییێك نەماوە لە رۆماندا سینگ دەرپەڕێنێ.

سەرهەنگ گاهاردو وەك مەست دەکەوتە بەرچاو، قومێکی دیی نۆشی و بە ئاسپایی گوتی:

ـ نابێ ئەوەندەیش ئومێدەواربین، هەندێ جار دوژمنێکی مردوو ترسناکترە لە دوژمنی زیندوو.

فرناندۆ بەپەلە ڕووی وەرچەرخاند بەتوڕەیی و نیگەراییەوە دەیڕوانییە روخسارە لائوبالییەکەی سەرهەنگ گاهاردو. لە مەبەستی گەیشت، بۆیە گوتی:

ـ فەرمان دەدەم جەستەی ئەو لە مەیدانی گشتی دا هەڵواسن تا هەموو کەسێ ببینێ، بەڵێ هەموو سەیرکەن کە زاپاتا مردووە و چیدی توانای ئەوەی نەماوە بۆ کۆمەکی ئەوان ڕاپەڕێ.

سەرهەنگ گاهاردو بێ ئەوەی بایەخ بداتە قسەکانی فرناندۆ ئامادە وەستا وەك ئەفسەرێ ڕێزی بۆ جەستەی زاپاتا نواند پاشان بتڵە شەرابەکەی کێشایە قەد دیواری قەڵاکە، شەرابێکی سوور بەدیوار و خاکی دامێنی دیوارەکەدا پەرش و بڵاوبووەوە. ئەم شەرابە ڕەنگی خوێنی هەبوو.

## ٢٦

خەڵکانی گوند لە دەوری جەستەی زاپاتا، لە مەیدانی گشتی گوندەکەدا کۆببوونەوە بێ جوڵە، بێ دەنگ دەیانڕوانییە جەستەی زاپاتا، لەنێوان ئەو هەموو پیاوانە تەنها ژنێك بەدی دەکرا ئەویش سلدادرا بوو.

لەنێوان چاوە قاوەییەکانیەوە، خەم و لێبوردن و بەزەیی شەپۆلیان دەدا، هەر لەو کاتەدا لازارۆ کە گەلێ پیر ببوو، دەبینرا لە کاتێکدا کە سەنگی خۆی دابووە سەر گۆچانەکەی و لەخەڵکەکە نزیك بووەوەو گەیشتە سەر جەستەی زاپاتا، بزەی تەوس ئامێز لێوانی لەیەك ترازاند و گوتی:

ـ ئەمانە دەیانەوێ کێ فریو بدەن. ئەم جەستەیە ڕەنگە هەموو کەسێ بێ. تەنها زاپاتا نیە، هەرگیز نابێ جەستەی زاپاتا بێ.

یەکێ لە گەنجەکان گوتی:

ـ دڵنیایت؟

لازارۆ گوتی:

ـ من لەم ساڵانەی دوایدا شان بەشانی زاپاتا دەجەنگیم بەچاکی دەیناسم.

ئەم پیاو کوژانە ناتوانن من فریو بدەن.

گەنجەکە، بەنیشانەی سەلماندی قسەکانی چەند جارێ سەری خۆی راتەکاندو گوتی:

ـ تۆ راست دەکەی، ئەوان ناتوانن هیچ کاتێ شکست بە ئەمیلیانۆ زاپاتا بدەن چونکە هیچ کاتێ ناتوانرێ جڵەوی رووباری خرۆشاو بگیرێ و بای سەرشیت رام کرێ.

لازارۆ بەدەنگێ کە چاوەروان نەدەکرا لەم پیرەوە هەند توندو رێك بێ ببیسترێ گوتی:

ـ ئەو روباری خرۆشان بای سەرشێت نیە، ئەو ئینسانە وەکو ئێمە، لەگەڵ ئەمانەشدا دوژمنەکانی هەرگیز ناتوانن بەسەریا زاڵ بن،

پاشان گۆچانەکەی بەرزکردەوە و ئیشارەتی بۆ گردەکان کرد و گوتی:

ـ ئەو لەنێوان ئەو گردە دوردەستانەدایە، ئەگەر جارێکی دی پێویستمان بەو بێ بێگومان رووەو ئێمە هەنگاو دەنێ.

وردە وردە دنیا تاریك دەبوو، هەتاو لە ئاسۆدا ون دەبوو پیاوە گەنجەکە وەك حاڵ گرتویێك چاوانی بڕیبووە گردە ئەرخەوانییەکان، کە تریفە کزەکەی مانگ نادیاری پێ بەخشی بوون، بەئاسپایی گوتی:

بەڵێ ئەو لەوێدایە، لەو کێوانەدا

چاوەڕێی ڕۆژی ڕاپەڕینە!